

وزارة التعليم العالي والبحث العلمي
جامعة صلاح الدين
كلية الاداب

کۆلیجی ئاداب
بەشی زمانی کوردی
پۆلی چوارەم

# زمانەوانی



محمد معروف فتاح

١٤١١هـ  ١٩٩٠م

زانکوی سه لاحه دین
کۆلیجی ئاداب
بەشی زمانی کوردی
پۆلی چوارەم


# زمانه وانی


محمد معروف فتاح



١٩٨٤

به یارمه تی زانکۆی سه لاحه دین
له چاپ دراوه

# به شی یه که م

## زمان و تایبه تیه کانی

### سه ره تا :

ئاشکرایة که زمان ده وریکی یه کجار بالاّ له ژیانی مروڤدا ده بینی بۆهه رلایه ك ده چین و به هه ر لایه کدا ده روانین ده بینین زمان له به ر ده ست و ده مایه و بۆته به شێکی وا له مروڤ که هه رگیز لی ی جیا نابێته وه . زمان چۆته بیره وه له گه ل خه وی مروڤدا تێکه ڵ بووه و ته نانه ت په یره ندی مروڤ له گه ل خه ڵکی ترو ده وروبه ریدا دیاری ده کات . بێ بوونی زمان گۆمه لی مرۆڤ نایه ته کایه چونکه بێ زمان به کارهێنان هاریکاری و هه ره وه زی که به ردی بناغه ی کومه ڵه پێك نایه ت . دیسان بێ بوونی زمان شارستانیه تی به رده وام نابێت چونکه زمان تاکه ریگه یه بۆ باراستن و گه یاندنی که لتوورو زانیاری له نه وه یه که وه بۆ نه وه یه کی تر .

گرنکی لێکدانه وه و تێ گه یشتنی راستی زمان له م خالانه ی خواره وه دا ده رده که وی ( Langacker , P , 4 ) .

١ . زۆر له گیروگرفته گرنگه کانی جیهانی ئه مرۆمان په یوه ندیه کی پته وییان به زمانه وه هه یه وبێ لێکدانه وه ی زمان ئه م کێشانه چاریکی دروستیان نابێ .

لێکولینه وه یه کی وردی زمان پێویسته بۆ چارکردنی ده یان کیشه ی وه ك :

أ . دانانی زمان جیهانی.( وه ك ئیسبرانتو ) چاکه و که م کورتی ئه م جۆره زمانه ده ستکردانه .

ب . زمانی بێگانه فێر بوون وپه یوه ندی به ته مه ن وئاستی خوینده واری خویندکاره وه .

جـ . په یوه ندی نێوان فه رهه نگ نووسین و رای خه ڵکی ده رباره ی وشه به کارهێنان .

د . زمان وله یه کتر گه یشتن یان نه گه یشتن .

هـ . په یوه ندی نێوان زمان و پێش که وتنی ئابووری و کومه لایه تی خه ڵکی . بۆ نموونه ، په یوه ندی زمان به قۆناغي نوێ کردنه وه ی بیشه سازییه وه .

و . نه خشه دانانی زمانی و سه پاندنی زمانی نه ته وایه تی ( ستانده ر ) و قه ده غه وهان دانی زاراو زمانی ناوچه یی .

٢ . لێکدانه وه ی زمان په یوه ندی به کێشه ی زانسته کانی تره وه هه یه . بۆنموونه . له به ر ئه وه ی زمان دیارده یه کی هۆشه کی یه لێکۆڵینه وه ی ڕیگایه که بۆ تێ گه یشتن له مێشکی مرۆڤ و چۆنیه تی دروست بوونی بیر . دیسان لێکدانه وه ی زمان هه ندی کێشه ی مه نتیق وفه لسه فه و کۆمه ڵناسی روون ده کاته وه .

له به ر ئه وه ی زمان ئه م دوو ده وره گرنگه ده بینێ له ژیانماندا شتێکی سه یر نی یه که له چه ند ڕوانگه یه کی جیا جیاوه سه یر بکری و لێ ی بکوڵرێته وه . له زۆر ده مێکه وه زمان سه رنجی فه یله سوف و شاره زایانی مێژوو و ئه نترۆپۆلۆجی و ده روون ناسی ڕاکێشا ، به ڵام ئه م شاره زایانه له ڕوانگه یه کی فراوانه وه له زمان ده کۆڵنه وه و په یوه نده ی له گه ڵ بوون و راستی و زانیاری وبیرو فێربووننا شی ده که نه وه بۆ چوونی ئه مانه بۆ زمان بۆ چوونێکی سوود لێ وه رگرتنه ـ به هۆی زمانه وه ده یانه وی له دیارده ی بگه ن و له دیارده ی تر بکۆڵنه وه ـ ده یانه وی له مێژوو مه نتیق و هونه ر ومێشکی مرۆڤ بگه ن .

به پێچه وانه ی شاره زایانی به شه کانی تری زانسته وه ، زمانه وان جگه له لێکۆلینه وه ی زمان به مه به ستی زمان خۆی هیچ مه به ستێکی تری نی یه وبه هۆی لێکدانه وه ی زمانه وه نایه وی له دیارده ی تر بگات و کێشه ی تر روون بکاته وه . ئه و راستی یه زمانیانه ی زمانه وان ده یان گاتێ له ئه نجامی لێکولینه وه دا له وانه یه له به شه کانی تری زانستا که ڵکیان لێ وه ربگیرێ به ڵام زمانه وان خۆی به گیروگرفتی به شه کانی تری زانسته وه خه ریك ناکات . له راستیشدا ئه و پێشکه وتنه ی که له نیوه ی یه که می ئه م سه ده یه دا له زمانه وانیدا رووی دابه زۆری له ئه نجامی ئه وه وه بوو که زمانه وانه کان ( به زۆری ئه رکبییه کان ) خۆیان دایه زمان خۆی وله ده ورو به ریان داپچراند و وه ك پیره وێکی داخراو سه یریان کرد . به دوای ئه م بۆ چوونه دا زمانه وانه کان توانیان خۆیان به پیره و رێکخستنی ناوه وه ی زمان خه ریك بکه ن و چه ند ئاستێکی زمانی دیاری بکه ن و له په یوه ندی نێوان ئه م ئاستانه بکولنه وه . ئه م داپچراندنه نه بووایه له وانه بوو زمانه وانی وه ك زانستێك نه هاتایه کایه وه .

## زمان چي يه ؟

پێناسه ی دیارده یه کی وه کو زمان کارێکی ئاسان نی یه بـه تایبـه تی له بـه ر ئـه وه ی دیارده کـه له زۆر روانگـه ی جۆربـه جۆره وه سـه یر ده کـریٚ و هـه ر شاره زایه ك له چوارچێوه ی بابه ته کانی خۆیه وه لیٚی ده کۆڵیته وه . بیٚ گومـان پیناسه ی زانایانی ده رون و زانایانی کۆزمانه وانی وزمانه وان و ئه ندازیاری ده نگ و فه یله سوفه کانی ناشی وه ك یه ك بن له به ر ئه وه زمان ده یان پێناسه ی جیاوازی کراوه و واله خواره وه چه ند پێناسه یه کی له روانکه ی زمانه وانیه وه ده خه ینه روو :

١ . زمان هۆیه که بۆ له یه کتر گه یشتن ، ده کریٚت به چه ند دانه یه کی ورده وه (مۆرفیم ) که هه ر یه که یان خاوه نی واتاو فورمن ( مارتنیت )
٢ . زمان پیٚره ویکی ده نگیه بۆ له یه کتر گه یشتن به کاردیٚت و به هۆی رشته ی وتن وبیستنه وه له کۆمه لیٚکی دیاری کراودا کارده کات . ده نگـه کان ره مـزن و واتا له خۆوه وه رده گرن .
٣ . کومه لٰه رسته یه که که ریٚزمان ده ریان ده کات . (چومسکی )
٤ . زمان هۆیه کی ناغه ریزی تایبه تی به مروڤه بۆ ده ربرینی هه ست و ئاره زوو به کاردیت و به هۆی ره مزی له سه ر له یاسا رۆشتووه وه کار ده کـات و له ژیـر ده سه لاتی مروڤدایه ( ساپیر ) . ( Pei , P 141 )
٥ . زمان بریتی یه له چه ند ره مزیکی له خۆوه که به هۆیه وه کۆمـه ل ده توانی هه ره وه زی بکات ( بلۆك وتراگه ر ) . ( Pei , 14: )
٦ . زمان کۆمـه لٰه ره مزێکی ده نگی ی له خۆوه یه که ده توانـری به کـاربیٚت بۆ له یه کتر گه یشتن وپۆل کردنی شتو رووداوه کانی ده وروبه ر ( کارول )
٧ . زمان کۆمه له شیٚوازێکی جیایه که هه ریه که یان بۆ بارێکی تایبه تی ده ست ده دات ( کۆزمانه وانه کان ) .
هه موو ئه م پیناسانه له وه دا ریك ده که وی که زمان چه ند تایبه تی یه کی هه یه :
( Bolinger , PP.22 - 25 ) -

## تایبه تی یه کانی زمان

:-

### ١ . زمان پێره وه

ئه گه ر زمان خاوه نی پێره وێکی تایبه تی نه بێت ، ئه واکه س ناتوانی فێری ببێت . زمان له راستیدا له دوو پیره وی سه ره کی پێك دێ پێره وی ده نگ وپێره وی واتا

پێره وی ده نگی زمان له وه دا ده رده که وی که له و هه موو ده نگـه جۆربـه جۆرانه ی مرۆڤ ده توانی ده ریان بهێنی ، هاوزمانان ته نیا که لَك له ژماره یه کی زۆر که م له مانه وه رده گرن به واتای به کاری دێنن . له ناو ئه مانه شدا ته نانه ت ژماره یه کی که متریان له یه ك ده درێن بۆ ئه وه ی واتا ده ست بخه ن . بۆ نموونه ، له نێو ئه و هه موو ده نگانه ی که له سروشتا هه ن کوردی نزیکه ی چل ده نگێکیان لێ هه لَ ده بژێری وهه موو لێکدانێکی ئه و ده نگانه ش ، بۆ نموونه ( ڕاو / ری / لاو ) واتـا نـابـه خشن ، پێـره وی ده نگی زمـان رێگـه ی ئـه وه مـان ده دات که ژماره یه کی که می ده نگ دووباره و سێ باره بکه ینه وه له رۆنـانی جیاجیـادا تاوه کو دانه ی واتایی دروست بێت . پێره وی واتایی زمانیش رێگه ی ئه م دانه واتاییانه ( واته ئه م مۆرفیمانه ) ده دات که له ژماره یه کی زۆر وشـه دا دووباره بنه وه تاوه کو مرۆڤ بتوانی به ئاسانی له چوار چێوه ی زمانه که یدا چه مکی ساده و ئالَوز ده ربڕی .

### ٢ ـ زمان ره مزه :

که ده لَێین ده نگه کانی زمان ( ره مزن ) مه به ستمان ئه وه یه که ئه م ده نگانه شتێك ده نوێنن که خۆیان نین وپـه یوه نـدی نێوان شتـه که و ئـه و ده نگه کـه ی ده ینوێنی په یوه ندییـه کی له خـۆوه یه . بـه شێوه یـه کی گشتی سێ جۆر ره مـز له ئارادا هه یه : ( ١ ) ره مزی وێنه یی که تێدا په یوه ندی لێکچوون هه یه له نێوان ده نگ وواتادا : وه ك (( ده ست بردن بۆ ده م )) بۆ گه یاندنی (( برسێتی )) یان ((

ده ست راوه شاندن )) بۆ گه یاندنی (( هه ره شه )) ( ٢ ) ره مزی هۆیی ( سه به بی ) ، وه ك (( زه رد هه لْگه ران )) له (( نه خۆشی )) یان (( ترس )) داو سووربوونه وه له (( توره یی )) یان (( شه رم )) دا (( هه ور )) وه ك نیشانه یه کی (( باران )) یان په یوه ندی (( سه هول به ندان )) و (( نزم بوونه وه ی پله ی گه رما )) ( ٣ ) ره مزی له خۆوه ، که تییدا هیچ په یوه ندییه ك له نیوان (( ده نگ )) و (( واتا )) دا نیه وه ك (( بلیسه )) یان (( مه شخه ل ) به واتای (( خوینده واری )) (( خۆر )) به واتای (( ئازادی )) و (( روناکی )) و (( سه ربه ستی )) .

ره مزی له خۆوه پێویستی بـه لێکدانـه وه ی هه یـه وتا تێت نـه گه یـه نن ، واتاکه ی نازانیت ./ زمانی مروڤ به زۆری ئه م جۆره ره مزه به کار دینی وهه ر ئه م ره مز به کارهینانه شه که زمانی مروڤی کردووه به چه کیکی کاریگه ر . ره مزی وینه یی وای (( له زمانی گیانـدارانی تر کـردوه که هـه رباسی ئیستـه یان بکـری به پیچه وانه ی زمانی مروڤه وه که ده توانی نه ك هه ر باسی ئیسته به لْکو پاشه رۆژ ورابووردو ته نانه ت له باری وا بدوێت که هه ر نابیت وه ك له رسته ی مه رجی وخوزگه یی ده بینین ، (( خوزگه ده هات )) ( له وانه یه هه ر نه یه ت ) ئه گه ر دوێنی لێره ده بویت . ( باسی دنیایه که که هه رگیز نابیت چونکه به سه ر چـووه ونه بووه وناگه رێته وه ) . ( Dineen,1967,31 ) .

## ٣ ـ زمان ده نگه :

لێره دا مه به ستمان له وه یه که زمان پێـویستی به قـه ناتی ده م وگـوێ هه یـه وبه لای که مه وه ده بێت قسه که رێك وگـویگرێکمـان هه بێت ( هـه ر چه نـده هه ردوو ده وره که تاکه که سیك ده توانی پێکه وه بیان بینی وه ك کاتێك که سێك له به ر خۆیه وه قسـه بکات ) ودوو کـه سه کـه ش ده توانن ده وره کـانیان ئـالو گوره که ن به واتای ئه وه ی گویگر ببێته قسه که رو به پێچه وانه وه .

له سه رێکی تریشه وه زمان ده نگه چونکه قسه له نووسین له پێشتره هه روه ك به لْگه ی مێژوویی وئه و به لْگانه ی له فێربوونی زماندا ده ستمان که وتووه ده ری ده خه ن . (( نووسین )) زمان نیه به لْکو بریتیه له و هه ولْه ی مـروڤ داویتی بۆ پاراستنی (( قسه )) .

## ٤ ـ زمان تایبه تی یه به مرۆڤ :

له دێرترین رۆژگاره و باوه ڕ وابووه که زمان مرۆڤ له هه موو گیانداره کانی تر جیا ده کاته وه چونکه ته نیا مرۆڤ به هره و توانای قسه کردنی تێدایه . بێ گومان ئاژه ڵ وپه له وه رو گیان له به رانی تر به گشتی پێره ویکیان هه یه هه رچه نده زۆر ساده ش بێت بۆ له یه کتر گه یشتن به ڵام ئه م (( زمانانه )) له چالاکیدا زۆر له زمان که مترن ورێگه ی گیانداران ناده ن له رابوردوو یان پاشه رۆژیان بکۆڵنه وه ودرۆ بکه ن یان شت له زمانی تره وه وه ربگێرن . له به ر ئه م هۆیانه پێره وه کانیان ناچێته ریزی زمان وئه و به هایه ی نادرێتی هه رچه نده ناوکوو لێکچوونیان زۆریش بێت .

## په یدابوونی زمـــان

### سه ره تا :

لـه گه ڵ ئـه وه شدا کـه کێشه ی چـۆنیه تی پـه یدا بـوونی زمـان هـه ر زۆر له ده مێکه وه سه رنجی روناك بیرو زمانه واناني راکێشاوه ، زانیاریمان تائێسته که ش ده ربـاره ی دیارده کـه به شێـوه یه کی گشتی زۆر کـه مه و ئـه و تیورانـه ی له م باره یه وه خراونه ته روو ته نیا به ناو تیورن وزۆربه یان بریتین لـه بیری سـاده ی نه سه لماو . ئه مه ش ده گه ریته وه بۆ چه ند کۆسپو ته گه ره یه کی گه وره که زۆر جار دێته ری ی لێکولینوه ی مێژویی به شێوه یه کی گشتی .

### له م کۆسپانه : ـ

١ ـ له پاش په یدابوونی زمانه کانی ئه م سه رده مه مه لبه ندی زمان له ناوچووه بێ ئه وه ی پاش ماوه یه کی ئه وتۆ به جێ بهێلی به هۆی دانه هاتنی نوسینه وه .

٢ ـ ته نانه ت پاشماوه ی ناراسته وخۆش له ئارادا نه بووه كه بیریكمان بداتێ ده رباره ی په یدابوونی وتن . ئه مه بۆمان روون ده كاته وه بۆچی ئه و هه ولانه ی رابوردوو زیاتر بیركردنه وه ن نه ك تیور . گوی دان به كێشه كه و نه بوونی كه ره سه ی پێویست بۆ لێكولینه وه ی روناكبیرانی ناچاركرد كه تیوری جیا جیاو ساده بخه نه روو . ( West,1967,3 ) .

٣ ـ له به ر نه بوونی پاشماوه ئه و گریمانانه ی ده رباره ی په یدابوونی زمانن ناچاربوون پشت به به لگه ی ناراسته وخو ببه ستن ، ئه و به لگانه ی كه له لێكولینه وه ی تره وه چنگك ده كه ون وه ك لێكولینه وه له زمانی ساواو له نه خوشیه كانی وتن وله زمانه ساده كانی مرۆڤ وله ره وشتی گیان له به ر پێشكه وتووه كان . . . . . . هتد .

## چه ند گریمانه یه ك ده رباره ی زمان په یدابوون :

ژماره یه كی زۆر گریمانه ده رباره ی په یدابوونی زمان له ئارادان . گرنگترینیان ئه مانه ن : ـ ( Barber,27 - 41 ) .

### ١ ـ گریمانه ی ده نگه سروشتیه كان :

ئه م گریمانه بۆیه كه م جار له سه ده ی چوار یان پینج ی پیش زاین دا له لایه ن دیمركریته س وئیفلاتوونه وه خراوه ته به ر چاو . له سه ده ی حه فده وه هه شده شدا له لایه ن ( لایبنیز ) ه وه پشت گیری كرا . له سه ده ی نوزده شدا داروین وویتنیش په سه ندیان ده كرد . به پێ ی ئه م گریمانه زمان له لاسایی ده نگه سروشتیه كانه وه په یدابووه . گریمان كه باوه ری وایه كه دانه ده نگیه كان ( كه لاسایی ئه و ده نگانه ن كه گیان له به ریان سروشت ده ریان ده هێنی ) بونه ته ناو بۆ كه لوپه ل وگیان له به رانی ده وروبه ری مرۆڤ . بۆ سه لماندنی گریمانه كه خاوه نه كانی په نا ده به نه به ر ئه و وشانه ی كه گوایه له لاسایی ده نگه سروشتیه كانه وه هاتونه ته كایه وه وه ك وشه ی (( حه په )) غوڕه (( بۆله وگرمه )) . . . هتد له كوردیدا . كه مو كورتی گریمانه كه له وه دا ده رده كه وێت كه :

( ١ ) تیمان ناگه یه نی بۆچی ئه م وشانه له هه موو زمانه كانی جیهاندا یه ك فۆرمیان
ی یه . حه په ی سه گی كوردی بۆچی (( باوی )) سه گی یابانی بێت له كاتێكا كه
ه ردووكیان لاسایی یه ك ده نگی سروشتی بن . (نباح)
( ٢ ) بۆمان روون ناكاته وه زمان له كوی وه بووه به خاوه نی رۆنانیكی واثالۆوز .

## ٢ ـ گریمانه ی بانگو قیژه ی هه ست ده ربر :

( The Pooh - Pooh Theory )

به پێ ی ئه م گریمانه كه بۆ یه كه م جار زانای ئه لمانی ( شتاینتال ) وده سته یه ك
ـه رووناك بیـران له سـه ده ی نۆزده دا خستیـانه بـه رده ست زمان لـه و ده نگه
غه ریزیانه وه په یدا بووه كه مرۆڤ بۆ ده ربرینی خۆشی وناخۆشی ئـازارو په ستی
ه كاری هێنـاوه . به بـاوه ری ئه م گـریمانـه یه كـه گۆلوتن له زمـاندا لـه شێوه ی
سه رسورماندا بووه .

هه ر چه نده ئه م گریمانـه سه رچـاوه ی هه نـدێك لـه و كه ره سـانه مـان بو
ـه رده خات كه زمان به كاری هێناوه كه موكورتی گریمانه كه ی پێشوومان بۆ چار
ناكات . به واتایه كی تر تیمان ناگه یه نێت ئه و رۆنانه ئالۆزانه ی زمان له كوێ وه
هاتوون . جگه له مه ش گریمانه روونی ناكاته وه چۆن زمان له م بانگه وقیـژه وه
گه یشتۆته قۆناغی ره مز به كارهێنان .

## ٣ ـ گریمانه ی بزاوتن : ( Gesture Theory )

ئاشكرایه كه له قاندنی سه رو جولاندنی ده ست زۆربـه ر له قسـه هاتـۆنه تـه
كایه وه به لگه ش بۆ ئه مه بلاوی سه ر له قاندن وچاو تروكاندن ولێو قوچاندنه بۆ
له یه كتر گه یشتن له ناو مرۆڤه ساده كاندا . هه ر له به ر ئه مه شه كه هه ندی
زمـانه وان ( ڤـونت له ئه لمانیاوه مار له یه كێتی سوفیت) باوه ریان وابوو كه له یه كتر
گه یشتن لـه ناومرۆڤدا له بنه ره تدا له م جۆره بزاوتنه وه بووه كه له دواییدا گوراوه به
زمانی ئاسایی .
هه ندێك له م زمانه وانانه زۆر توندو تیژ ن له باوه ره كه یاندا پێیان وایه كه وتن
تاراده یه ك گه شه یه كی نوێ یه و ده گه رێته وه بۆ ( ٣٥٠٠ ) سال پێش زایینی وله

نووسینی وێنه یی یه وه درووست بووه که ئه میش هه وڵیکی مرۆڤ بووه بۆ نواندنی بزاوتن . ئه م رایه زۆر ڕێ ی تێ ناچێت چونکه ئێمه له ویاوه ره دا نین که مرۆڤ توانی بێتی ئه و شاره ستانیه پێشکه وتووه ی سه رده می به ردی نوێ به دی بهێنێت پێش درووست بوونی وتن . به تایبه تی له کاتێکدا که زۆر ئاشکرایه بزاوتن کـه م وکورتی زۆره و کارتێکده ره له به ر ئه وه ی ده ستی مرۆڤ ده گرێت له تاریکی وکاتی بوونی کوسپا که لکی لێ وه رناگیرێ .

شێوه یه کی تر له گریمانه ی بزاوتن که زیاتر ڕێ ی تێ ده چێت گریمانه ی ده م بزاوتنه که له م دواییه دا زانای فه ره نسی ( پیاجییه ) خستویـه تیه بـه رده ست .

به پێ ی ئه م گریمانـه مرۆڤی سـاده له بنـه ره تدا بـه هۆی بـزاوتنه وه لـه یه کـتر گه یشتوون . کاتێك مرۆڤ زیره کی وته کنیکی به ره و پێشـه وه هاتـوه پێویستی به بزاوتنی ورد تربووه . جاله به ر ئه وه ی که ده ستیشی به کاره وه خه ریك بووه ناچار بووه پێ ئه وه ی ئاگاداربیت ئه و بزاوتنانه بگوریته وه به بزاوتنی ماسولکه کانی زمان ولێوو ده م وقورگه . پاش ماوه یه ك مرۆڤ به تاقی کردنه وه بۆی ده رکه وتوه ئه گه ر پالێك به و هه وایه وه بنێت که به ناو ده م ولوتدا تیپه ر ده بێت بزاوتنه که ده نگه وه رده گرێ وه ك به چپه دوان . خۆ ئه گه ر له هه مان کاتیشدا بقیژێنی یان ببۆڵێنی ئه وا ده توانیت وتنی ئاوازه دار ده رکات . له گه ڵ ئه وه شدا که ئه م تیوره زیاتر له وانه ی پێشـوو بۆمـان ده رده خات کـه زمان چـۆن په یـدا بووه وچـاری په یوه ندی نێوان واتاو ده نگه تا راده یه ك ده کات ، ره خنه یه کی زۆر له و ریگایه ده گیریت که پیاجییه له لێکۆلینه وه که یاگرتویه تی . پیاجیه ساوایه کی که ڕو لاڵی زکماك ده خاته ریزی مرۆڤی ساده وگه شه ی نائاسـایی ساوایـه کی وا لـه گـه ل گه شه ی ئاسایی مرۆڤدا به یه ك چاو سه یر ده کات . ئاشکرایه که ئـه و باره ی ساوایه کی که ڕو لاڵی زکماك تێیدا په روه رده ده کرێت زۆر جیاوازه لـه و باره ی که مرۆڤ ئاسایی تێیدا گه شه ده کا . به پێچه وانه ی ساوایه کی که ڕو لاڵه وه ، مرۆڤ چه ند ساده ش بێت خاوه ن رشته یه کی وردی بیستنه . چینی ده ره وه ی خانه کانی مێشکی مرۆڤی ساده گه شه یه کی ناته واو ده کات له کـاتێکا کـه ئه م خانانه له مرۆڤیکی که ڕو لاڵدا ته واو گه شه ی کردووه . جگه له مه ش مرۆڤیکی که ڕو لاڵ له باریکی کومه لایه تی پێش که وتوودا ده ژی . له به ر ئه م جیاوازیيانه ئه م دووانه مه رج نی یه وه ك یه کتر فێری زمان ببن .

یه کیك له که موو کورتیه سه ره کیه کانی ئه م گریمانه یه له وه دایه که گه شه و په یدا بوونی وتن له باری کومه لآیه تی وژیان جیاده کاته وه هه ر وه ك ئه م دوانه په یوه ندیان له گه ڵ یه کتریدا نه بیّت . هه روه ها په یدا بوونی زمان دوور له کارو دوور لـه ده ورو به ری مـروّف لیّك ده داتـه وه به واتـایه کی تـر کورتی تیـوره که له وه دایه که په یدابوونی زمان له میّژ ووی گه شه کردنی مروڤ دور ده خاته وه .

## ٤ ـ گریمانه ی موسیقا ( The Musical Theory )

به پیّ ی ئه م گریمانه که بوّ یه که م جار له لایه ن یسپرسنه وه خراوه ته رووزمان له گوّرانیه وه هاتووه یان هه ردووکیان له یه ك بنچینه وه دروست بوون . به باوه ری یسپرسن زمان له گه شه کردنیدا به چه ند قوناغیّکدا تیّپه ر بووه . له قوّناغیّکـدا زمان بریتی بووه له وشه ی دریّژ ی پـر له ده نگی قـورس وچه نـاگه شکیّن له م قوّناغه یدا زمانی مروّڤ به ئاوازیه تر بووه له زمانه کانی مروّڤی ئه مروّ .
پیّش ئه م قوناغه ش زمانی مروڤ بریتی بووه له گوّرانیه کی بیّ وشه ( هه ر ئاواز ) که ته نیا به مه به ستی هه ست ده ربرین به کار هاتووه و بوّ تی گه یشتن ی خه لکی نه بووه . که لّکی ئه م گریمانه له وه دایه که ره سه ی زمانمان بوّ دیاری ده کات . به لاّم هه موو که م وکوری بیره کانی تری تیّدا به دی ده کریّ .

## ٥ ـ گریمانه ی په یوه ندی : ( The Contact Theory )

به پیّ ی ئه م گریمانه که له م سالاّنه ی دواییه دا له لایه ن ( ریّڤیزه وه ) خراوه ته روو زمان له ئه نجامی ئه و غه ریزه به تینه وه دروست ده بیّ که له مروّڤدا هه یه بوّ په یوه ندی کردن . به باوه ری ریّڤیز زمان به چه ند قوناغیّکدا تیّپه ر بووه وپیّش ئه وه ی بگاته ئه و گه شه یه ی ئیّسته ی . له قوّناغی یه که می دا ، ( قوّناغی قیژه ) زمان ئاراسته ی ده وروبه ر کراوه و بوّ تی گه یاندن نه بووه . له قوّناغی دووه مدا ( قوّناغی بانگه ) زمان ئاراسته ی که سانی ده وروبه ر کراوه و به هیوای هیّنانه دی ئـاوات وویستی قسه کـه ران بووه . لـه قوّنـاغی سیه مـدا ( قوّنـاغی ووشه ) ، ده نگه کان وه ك ره مز به کاردیّن وئه مه ش هه ر له توانای مروّڤدا به دی ده کریّ .
یه که م گوتن ، به باوه ری ریّڤیز لـه شیّوه ی داوایـان فرمـاندا بـووه وله دوایـدا

شێوه کانی تریش (( هه واڵدان )) و (( پرسیار )) کردن هاتوونه ته کایه وه .

چاکه ی ئه م گریمانه له وه دایه که قۆناغه کانی درووست بوونی زمان شی ده کاته وه و به شێوه یه کی روون وماقوول ده یان خاته روو . که م و کورتیش له وه دایه که ( ۱ ) بۆمان روون ناکاته وه زمانی مرۆڤ چۆن گه یشتوته قوناغی ده ربرین ( ۲ ) تأکیدیکی زۆر ده خاته سه ر ئه و غه ریزه یه ی که له مرۆڤدا هه یه بۆ قسه کردن وتی گه یشتن وپه یدابوونی زمان ده داته پاڵ ئه م غه ریزه یه بێ ئه وه ی گوی بداته ده وری کاری هه ره وه زی له دروست کردنی کۆمه ڵ وزماندا .

( Barber , 38 )

**ئه نجام :**

زانیاری ئێسته مان ده رباره ی په یدا بوونی زمان وگه شه کردنی ئه وه نده نی یه وامان لی بکات یه کێك له م گریمانانه په سه ند بکه ین وئه وانی تر بخه ینه لاوه و به واتایه کی تر هه ر یه کێك له م گریمانه وه رگرین ده بینین که مێك له راستی به ده ست هێناوه نه ك هه موو راستیه که بۆ گومان به لای ئێمه وه ئه و گریمانانه په سه ند ترن که په یدابوونی زمان ده به ستن به په یدابوونی کومه ڵ وکاری گه لیه وه چونکه له م قۆناغه دا مروڤ پێویستی ته واوی به زمان بووه وهه ستی به م پێویستیه کردووه و به لای ئێمه وه ، بۆ لێکدانه وه ی چۆنیه تی په یدابوونی زمان پێویستمان به چوار شت هه یه : ( ۱ ) ئه و بارو هۆیانه ی که پاڵیان به مرۆڤه وه ناوه له خه ڵکی تر بگات ( ۲ ) ئه و که ره سه مادیانه ی که له گوتندا به کاریان دێنی ( ده نگه ، بزاوتن . . . . . هتد ) ( ۳ ) چۆن ئه و که ره سه مادیانه ( ده نگه کان ) ده بنه وێنه ی ئه و شتانه ی که له ده ورو به ری مرۆڤدا هه ن . ( ٤ ) ئه و قۆناغانه کامانه ن که گوتنیان پێدا تێپه ریوه تاگه یشتۆته ئه وباره ئاڵۆزه ی ئێسته ی .

## زمانی مرۆڤ و (( زمانی )) زینده وه ری تر

زمانی مرۆڤ له زۆر سه ره وه‌له‌قیژه وبانگی زینده وه ری تر ده چێت وه ك به م خالانه ی خواره وه دا بۆمان ده رده كه وێت : ( Strang , 10 )

١ ـ وه ك ده ركه وتوه هه ردوو جۆره كه كه لَك له فۆنیم وه رده گرن* . ژماره ی ئه م فۆنیمانه له زمانی مرۆڤدا له نیوان ( ١١ ) و ( ٦٧ ) دایه . ژماره ی فۆنیمه كانی زمانی گیان له به ری تر له نێوان ( ٧ ) و ( ٣٧ ) دایه . به لام كه موزۆری فۆنیم كار ناكاته سه ر پێش كه وتوویی یان دواكه وتوی زمان ، چونكه كه م وكورتی وا ده توانرێت له ئاستی تردا پر بكرێته وه .

٢ ـ لێكولینه وه كانی ئه م دوایه ته واو روونی كردۆته وه كه ره مز ته نیا له زمانی مرۆڤدا به كارنایه ت . به لَكو گیان له به رانیتریش كه لَكی لی وه رده گرن . ته نیا جیاوازی له وه دایه كه زمانی مرۆڤ كه لَك زیاتر له ره مزی له خۆوه وه رده گرێت ، به لام زمانی گیان له به ری تر پشت به ره مزی وێنه یی ده به ستێت . ئه مه ش تاراده یه ك له چالاكی ئه و زمانانه كه م ده كاته وه .

٣ ـ مه به ست له به كارهێنای هه ردوو جۆره زمانه كه گه یاندنی مه به سته رگه یاندنی هه ستو پۆلكـردنی ده وروبه ر ) بـه واتایـه كی تر هـه ردوو جۆره كـه له كۆمه لَدا به كاردێن و به لای كه مه وه بۆ تی گه یشتن لێیان پێویستمان به دوورۆلَه ، قسه كه روگوی گر . زۆربه ی كات به لای كه مه وه دووانمان پێویسته بۆئه وه ی له یه كتر گه یشتن پێته دی به لام هه ندی جار هه ردوو رۆلَه كه به یه كێك ده بینرێن .

٤ ـ لـه هه ردووكیـاندا نیشـانه ده نگیـه كان بـه رێك و پێكی خـۆیـان دووپـات ده كه نه وه له رێچكه ی وتندا .

٥ ـ له هه ردووكیاندا رۆلَ گۆرینه وما نه یه . ئه و زینده وه ره ی كه ده نگه كان ده رده كات توانای ئه وه شی هه یه ده نگـه كان وه ربگـرێت و شییان بكـاته وه و لێیان بگات . به م جۆره قسه كه ر ده توانێت ببێته گـوێگر یـان بیسته ر و به پێچه وانه شه وه .

٦ ـ له هه ردووکیاندا به کارهێنانی ره مزه کان ( گوتن ) ده بێته هۆی ده رکه وتنی ره وشتێکی دیاری کراو له گوگردا . ئه م ره وشته ش ده بێت له گه ڵ مه به ستی وتنه که دا بگونجێت هه ر ئه م ره وشته شه که بۆمان ده رده خات تۆ گه یشتن له ئارادا هه یه یان نا .
٧ ـ هه ردوو جۆره زمانه که رێگه ی ده م و گوی به کاردێنن بۆ له یه کتر گه یشتن . به کار هێنانی ئه م رێگه یه له دووسه ره وه که ڵکی هه یه بۆ زینده وه ر . یه که م : زینده وه ر پێویستی به وزه یه کی زۆر که مه تاقه ناته که بخاته گه ر . دووه م : گوتن ، یان قسه کردن رێگه له چالاکی تر ناگرێت . به م جۆره زینده وه ر ده توانێت به ده م قسه وه نان بخوات ، رابکات . . . . . هتد .
٨ ـ هه ردوو جۆره زمانه که خاوه نی یاسای رسته یی ووتایی تایبه تی خۆیانن ، به واتای ئه وه ی که ریزکردن و خستنه پاڵ یه کتری لێکدانی ره مزه کان به ئاره زووله خۆوه و بێ یاسا نابن . به ڵکو ری و شوێنێکی تایبه تی خۆیان هه یه .
٩ ـ له هه ردووکیاندا ره مزه کانی گوتن پاش ماوه یه ك له ده م ده رچوون له ناو ده چن و جارێکی تر گوێگر / بیسته ر بۆی ناگه رێته وه دواوه . به م جۆره مێشکی قسه که ر / گوێگر ئه رکێکی گه وره ی ده که وێته ئه ستۆ ئه ویش کۆکردنه وه یه (هه ڵ گرتن ) . هه ر ئه م ئه رکه گرانه یه که وای کردوه مرۆڤ بیر له نووسین بکاته وه .
١٠ ـ له هه ردووزمانه که دا بڵاوبونه وه ی ده نگه کان به هه موو لایه کدایه (ئاراسته نه کراوه ) . به پێچه وانه وه وه رگرتنی ده نگ پێویستی به ئاراسته کردنی گوێیه .
١١ ـ له هه ردووکیاندا ئه و زانیاریه ی که ره مزه کان ده ی گه یه نن هه مووی به یه کجار به سه ر یه که وه ناگه نه گوێ به ڵکو به ره به ره ده گاته گوێ و مێشك .
دیاره رێچکه ی گوتن و ئاوازه که ی جیانابێته وه له یه کتری ، به لام ئه م پێکه وه گه یشتنه یان ئه رکێکی واگران ناخاته سه ر مێشك که به راورد بکرێت له گه ل ئه و ئه رکه ی که چاو بۆ مێشکی دروست ده کات به وه ی وێنه ی ده یان شت له یه ك کاتدا ده نێرێت بۆ لێکدانه وه . له م به راورده ی سه ره وه دا بۆمان ده رده که وێت که زمانی زینده وه ری تریش هه ر ده بێت به زمان دابنرێت ئه گه ر چی له پله ی

پێش که وتوویی و چالاکیدا ناگاته زمانی مرۆڤ ، چونکه له بنه ره تدا وه ك یه كن ، یه ك كه ره سه به كاردینن ، یه ك ریگه ده گرن و بۆ یه ك مه به ستن . ته نیا له وه دا جیاوازن كه چه ند تایبه تیه كیان كه مه بۆ ئه وه ی بگه نه زمانی مرۆڤ له پله دا .
له م تایبه تیانه : ـ

١ . یه یوه ندی نیشانه و واتا لـه زمانی مـرۆڤدا یـه یوه نـدییه كی لـه خۆوه یـه (ره مزه كانی له خۆوه ن ) .

٢ . له زمانی ئاده میزادا گۆرینی فۆرم ده بێته هۆی گۆرینی واتا ( یه ل / یه ڵ ) .
(شار / شاره كه / شارێك / شاره كان ) . . . . . هتد .

٣ . له زمانی مرۆڤدا ئه وریچكه ده نگه كه له ده م ده رده چێت ده وتوانرێت كه رت بكرێت ، به واتای ئه وه ی ریچكه ده نگه كه بریتی یه له دانه ی زمان له ناو دانه ی تردا . به م جۆره رسته ی ئالۆز بریتی یه له چه ند رسته یه كی ساده ، رسته ی ساده له فریزی ناوو فریزی كارو ئه مانه ش له وشه و وشه ش له مۆرفیم ، مۆرفیمیش خۆی به هۆی فۆنیمه وه ده نوینرێت . ئه م دانانه ش هه ریه كه یان له ئاستیكی زماندا كارده كه ن : مۆرفیم له ئاستی وشه سازی و فۆنیم له ئاستی ده نگه رسته له ئاستی رسته سازیدا . هه ریه كه ش له م دانانه پله یه كی تایبه تیان هه یه و ئه وانه ی پله یان به رزه ( بۆ نموونه ، رسته ) نابنه به شێك یـان ناچنـه ناو پله نزمه كانه وه تاپله كانیان نزم نه كه نه وه .

٤ . زمانی ئاده میزاد به پێچه وانه ی زمانی زینده وه ری تره وه به هۆی فێربوونه وه له نه وه یه كه وه بۆ نه وه یه كی تر ده روات .

هیـچ به ڵگـه یه كی زانیـاری له ئـارادا نیه كـه پێمان بسـه لمینی كـه منـاڵ زمـانی دایـك وباوكی ئـاسانـتر فێرده بێت . منـاڵ كه لـه دایك ده بێت ئـه و توانـایه ی له گه ڵدایه كه فێری زمانێك یان چه ند زمانێك بێت بێ دیاری كردن . جگه له م تایبه تیانه ش زمانی مرۆڤ چه ند توانایه كی تری تێدایه وه ك توانای شێواندن توانای ده ربرینی راستی و توانای وه رگێران .

ئه م لێكولینه وه بۆمـان ده رده خات كـه ئه و جیـاوازییانـه ی له نێـوان زمانی زینده وه ری ترو زمانی مرۆڤدا هه یه جیاوازییه له پله داو ناگاته ئه و راده یه ی هه ردوو جۆره زمانه كه ته واو له یه ك بگات یان وامان لێ بكات دوای بۆچوونه

... زمانه وانه سلوكيه كان بكه وين و گوێ نه ده ین به و هه موو ناوكۆییانه ی كه له نێوان هه ردوو جۆره زمانه كه دا ده بینرێت .

بۆ ... و به یه ندییه بگه ین كه له نێوان ئه م دوو جۆره زمانه دا هه یه پێویسته ... كه زمان به گشتی وه ك په یژه یه كی چه نده ها پله یی سه یر بكه ین . ... ترین پله ی په یژه كه دابنێین بۆ زمانی مرۆڤ له به ر ئه وه ی باشترین و چالاكترین جۆری زمانه . پله ی دوای ئه م دابنێین بۆ زمانی دۆلفین كه نزیك ده بێته وه له زمانی مرۆڤ . به دوای زمانی دۆلفین دا ، نزیكترین بانگه و قیژه بۆ زمانی مرۆڤ سه مای هه نگه چونكه چه ند تایبه تیه كی زمانی مرۆڤی تیا ده بینرێت وه ك به كارهێنانی ره مزی له خووه و توانای له یه كدان و بوونی ده نگه و یاسایه كی واتایی و توانای گوێزانه وه ... و شوێنی قسه ( بیان دووان له رابووردوو ... رانه ... ) ده وتوانین پله كانی تری په یژه كه ش ... زینده وه ره كانی تر ده گه ینه نزمترین زمان .

---

* به رای چارلز ئۆزگود ( ۱۹۸۰ ، ل٦ ) هه نگه ده توانی سێ زانیاری گرنگه بگه یه نی : ( ۱ ) هه ویه ی كه سی ( ۲ ) شوێنی شیله ( به هۆی سه ماوه ) ( ۳ ) دۆزینه وه ی هه واری نوێ . له به ر ئه وه ی شێوه ی سه ماكه كویرانه نی یه و هه نگه كاركه ره كان ده توانن ببن به قسه كه رو بیسته ریش و ره فتاره كه شیان به نده به و نامه یه وه كه ده یانه وێ بیگه یه نن و نامه كه ش هه ر له باره ی ئێسته وه نی یه ( هه رباسی شیله ی به رده ست و شوێنی له به رچاودا ناكات ) ده توانین پی سه لمێنین كه هه موو مه رجه سه ره كی یه كانی زمانی مرۆڤ له زمانی هه نگدا هه یه بۆ زانیاری زیاتر بروانه به شی یه كه می :

Lecture on Language Performanee , Charles . Osgood , 1980 , PP. 1 - 22

## چه ند ریگه یه کی تری په یوه ندی کردن

### سه ره تــــا :

مه به ستی سه ره کی له ... به کارهێنانی زمان تێ گه یشتنی ده رروبه ری مرۆڤه و په یوه ندی کردنه له خه ڵکی هاوزمانه وه ، به واتایه کی ساده تر زمان بۆ په یوه ندی کردنه له گه ل ده وروبه ردا . بێ گومان جگه له زمانی مرۆڤ ریگه ی تریشی دۆزیوه ته وه بۆ دابین کردنی ئه م په یوه ندی یه هه نـدی له م ریگـانه له گه ل زمان خۆیدا به کاردێن ( وه ك بزاوتنی ده ست و ده م و برۆ . . . هتد ) . هه ندێکی تریان به ته نیا خۆیان به بێ زمان به کاردێن بۆ په یوه ندی کردن ( وه ك گلۆپی هات و چوی ناو شاره کان گرنگی دان به ئیلیکدانه وه و شی کردنـه وه ی ئه م رێـگـایـانـه ی تـری پـه یـوه نـدی کـردن لـه زمـانـه وانـیـدا ده گه رێته وه بۆ ئه وه ی : -

١ . ئه م هۆیـانه لـه زۆر سه ره وه لـه زمان ده چن و وه ك زمـان دارێ... و له سه ریه ك بنه ماده رۆن بۆ نمونه زۆربه ی ئه م هۆیانه ی تری په یوه ندی کردن وه ك زمانی مرۆڤ خاوه نی پێره وو رونانن ، به واتای ئه وه ی له سه ر ده ستورێکی دیاری کراو ده رۆن به رێوه که ده توانرێن پێش بینی بکرێن . هه رله به ر ئه مه شه کـه خـه ڵکی ده تـوانێ وه ك زمـانێکی بێگـانـه فێـریـان بێت و بـه کـاریـان بێنی له زمانه وانیدا ، شی کردنه وه ی ئه م هۆیانه و لێکدانه وه یان به و هیوایه که ، (له به ر ئه وه ی له گه ل زماندا له یه کتر ده چن ) هه ندی له لایه نه شاراوه کـانی زمانی مرۆڤمان بۆ روون کاته وه ، به تایبـه تی په یـوه ندی نێـوان زمان و مێشـك کـه تائێستـه زۆر که م لـه باره یـه وه ده زانری لـه به ر ئـه وه ی له تـوانادا نی یـه راسته وخۆ له مێشك بکۆڵرێته وه .

٢ . ئه م هۆیانه ی تری په یـوه ندی کـردن نمونـه یه‌کی ساده و سـاکاری زمـانی مرۆڤن و له وانه شه زمان له قۆناغێکی مێژوویدا هه ر له شێوه ی ئه مانه‌دا بووبێت یان هه روه ك هه ندی زمانه وان باوه ریان وایه زمان بریتی بێت له گه شه ی یه کێك

له مانه ( بروانه ئه و گريمانه و تيورانه ى ده رباره ى زمان خراونه ته روو به تايبه تى گريمانه ى بزاوتن كه واته . ليكدانه وه و شى كردنه وه ى ئه م هويانه به و هيوايه شه كه راستى نويمان ده رباره ى چونيه تى په يدابوون و گه شه كردنى زمانى مروڤ ده ست كه وێ تابه هويانه وه بگه ينه تيوريكى په سه ند ده رباره ى ئه م كيشه يه كه هه زاران ساله مروڤ بيرى لێ ده كاته وه .

واله خواره وه هه ندێ له م هويانه ى په يوه ندى كردن به وردى شى ده كه ينه وه .

( Laver , 1967 , 341 )

## به شه كانى په يوه ندى ناوزمانى : ـ

به هه موو ئه و تايبه تيه ره وشتيانه ى كه په يوه ندى نازمانى پيك دينن ده وترێ په ره زمانى يان زمان ئاسا له به ر ئه م هويانه ى خواره وه :

( ١ ) له زور رووه وه ئه و تايبه تيه ره وشتيانه له زمان ده چن . بو نموونه ، وه ك زمان بريتين له ره مزى له خووه .

( ٢ ) ئه م تايبه تيانه هه ندێ جار ده بنه مشه خورو به سه ر زمانه وه ده ژين و ئه و گرنگيه ى هه يانه له زمانه وه وه رى ده گرن .

هه موو زمانه وانه كان له سه ر پيناسه ى تايبه تى په ره زمانى ريك ناكه ون . هه نديكيان ( له مانه كريسته ل ، تراگه ر ) ته نيا بو ئه و تايبه تيه ده نگيانه به كارى دينن كه له گه ل قسه كردندا دين . هه نديكى تريان ( وه ك ئه به ركرومبى ) بو تايبه تى ده نگى و نه نگى به كارى دينن و به هه موويان ده لين تايبه تى په ره زمانى :

### أ ـ تايبه تى ده نگى په ره زمانى :

ئه مانه ده بن به دوو به شه وه ( ١ ) ئه وانه ى بێ زمان به كاردين ( سه ربه خو ).

( ٢ ) ئه وانه ى له گه ل زماندا به كاردين ( ناسه ربه خو ) .

یه کێك لـه تایبـه تیه سه ربـه خۆکـانی ئه وانـه ن که ئـازارو سه رسـورمان ده رده برن ( وه ك : ئاخ ، ئۆف ، ئای . . . . . . هتد ) تایبه تی ناسه ربه خۆ زۆر هـه مه چـه شن و هه مـوو ئه وانـه ده گـرێتـه وه کـه پێیـان ده وتـری ( تـۆن ) که په یوه ندی یه کی راسته وخۆی به به رزی ونزمی ده نگه وه هه یـه . پێره وی تۆن له چه ند پله یه ك پێك دی ، گوتني ئاسایی ناوه راستی ئه م پلانه ده گرێ . بۆ په یوه ندی تایبه تی ( بۆ ده ربرینی توره یی یان رێز . . . هتد ) قسه که ریان به ره و پله کانی سه ره وه ده روا ( ده نگی به رز ده کاته وه ) یان بۆ خواره وه دێ ( ده نگه نزم ده کاته وه ) . که قسه که ر ده م ده کـاته وه ، ئـه و پله ده نگه ی هـه ڵی ده بـژێری هـه ندی لـه مه بـه ستی قسه کـه ر ده رده خات . ئـه گـه ر شێـوه ی گوتنه که ی له پله ی ناوه راسته وه نزیك بوو ، ئه وا گـوێگر واتـایه کی ئـاسایی ده دات به مه به سته که . لێکدانه وه ی مه به ستی گوتن به پێ ی دووری ونزیکی له پله ی ناوه راسته ، ده گۆرێ . که گوتنه که له پله ی ئاساییه وه دووربوو ، ئه وا گوێگر واتای ئاسایی ده دات به مه به سته کـه وته نـانه ت ، لـه وانه شـه ، به پێچه وانه وه ی ئاساییه وه مه به سته که لێك بداته وه . بۆ نموونه ، گوتنێك که زۆر درێژ کرێته وه یان زۆر کورت کرێته وه ( به په له بگـوترێ ) بـه لای گوێگـره وه ئـاسـایی نی یـه وواتـای ئـاسـایی نـادات بـه لکـو لەوانـه یـه بـه پێچـه وانــه ی مه به سته که شه وه لێکی بداته وه . بۆ ئه وه ی گوێگر به ته واوی له مـه به ستی قسه که ربگات ده بێ نه ك هه ر ناوه رۆکی نامه که بزانی به ڵکو جۆری گوتنه که ش له گه ل هۆکانی تردا له یه کتر بدات ( وه ك ته مه ن وجینسی قسه که ر وباری قسه که ر )
( Laver , 348 )

جگه له ( به رزو نزمی پله ی ده نگه ) ، گۆرینی پله ی ده نگه وخێرایی قسه کردن ویـه رده وامی وده ستگرتن بـه سه ر چـۆنیه تی ده نگـدا ( دروست کردنی نـووزه وهاره ی هووشه و منگنین . . . . . هتد ) ئه مانه هه موویان بریتین له تایبـه تی ده نگی په ره زمانی .

## ب - تایبه تی په ره زمانی :

١ . دوورو نزیکی : -

گرنگی ئه م پێره وه به تایبه تی له کاتی ئاخاوتندا ده رده که وێ وپه یوندییه کی راسته وخۆی هه یه له گه ل ( ١ ) په یوه ندی نێوان گوێگرو قسـه که رو پـایه ی کۆمه لایه تیان . بۆ نموونه ، دووری نێوان دوو هاورێ له کاتی قسه کردندا که متره وه ك له دووری نێوان دوو که سی نه ناسیاو یان که سێکی خاوه ن پایه و که سێکی بێ پایه . ( ٢ ) قۆناغی کاره که ، بۆ نموونه ، له سه ره تای ئاخاوتندا گوێگر وقسه که ر زیاتر له یه کتر نزیك ده بنه وه وه ك له ناوه راست وکۆتایی کارێکدا .

( ٣ ) شوێنی دانیشتنه که :

دوورو نزیکی له گه لێکه وه بۆ گه لێکی تر ده گورێ . ئـه و دوورییه ی کـه به لای ئه مریکیه وه ( نزیکه ) به لای زۆر گه لانی تره وه ( دووره ) .

جگه له مه ش له و دیدارانه دا که به شداره کانی له زۆر شوێنی جیهانه وه دێن واتێبینی کراوه که له سه ره تـای دانیشتنه کـه دا خه لکـه که بـه ره ده وام ده جولـێن تا هه ریه که یان به پێوانه ی گه له که یان دووریه ك له گه ل ده وروبه ره که یـاندا دیاري ده که ن .

راده ی دوورو نزیکی وبه کارهێنانی له کاتی ئاخاوتندا به هۆی فێربوونه وه له نه وه یه که وه ده چێت بۆ نه وه یه کی تر ، به لام وه نه بێ راده ی دوورونزیکی به ئاره زوو بۆ مه به ستی تایبه تی به کار نه یه ت . بۆ نموونه ، هه ندی گه وره له کاتی قسه کردندا به ئاره زوو له ( بچووك )نزیك ده که ونه وه بۆ رێز لێنان یان خۆ نزیك کردنه وه .

( ٢ ) بزاوتن :

مـه به ست لـه بزاوتن جـولاّنـدنـه وه ی ده ست وده م وچـاو ولێـوو بـرۆیـه به مه به ستی په یوه ندی کردن له گه ل خه لکی ده وروبه ردا . پێره وی بزاوتن هه روه ك پێره وی ده نگی په ره زمانی ( ده نگه به رزکردنه وه وده نـگه گۆرین ) زۆربه ی کات له گه ل زماندا به کاردێ . هه ندێ جاریش بزاوتن به ته نیا خۆی جێگه ی زمان ده گرێته وه ، به واتای ئه وه ی بۆپه یوه ندی کردن ده ست ده دات .

بزاوتن به فێربوون له نه وه یه که وه بۆ نه وه یه کی تر ده چێت واتای بزاوتنیش له گه لێکه وه بۆ گه لێکی تر ده گورێ . بۆ نموونه ، له م ناوچه یه دا سه ر جولاّندن

بۆ خواره وه بۆ رازی بوونه ، بۆ سه ره وه بۆ ره ت کردنه وه یه ، به م لەولادا بۆ سه رسورمان ونارازی بوونه . ئاشکرایه که له ناوچـه ی تردا مـه رج نی یه ئـه م بزاوتنانه هه مان واتایان هه بێت یان به هه مان مه به ست به کاربێن . دیسانه وه هه ر له م هه رێمانه دا له کاتی به یه کتر گه یشتن دا یان به سه رسلاو ده که ن ( بۆ خواره وه ) یان به زه رده خه نه یه کی سه ر لێوویان ( گه ر ماوه یه کی دووربێت به یه کتر نه گه یشتن ) به ماچ وگرتنه باوه ش . به پێچـه وانه ی ئـه مه وه ، لـه ناو ئـه سکیمـوکـانـدا بـۆ ...ـلاوکـردن ده بی سی جـار بمـاڵن بـه تـه وقی سـه ری به رامبه ره که یاندا ، له ناو دانیشتوانی ئه مریکای لاتینیدا ده بێ به پشتی یه کتریدا بماڵن وله ناوچه ی پولینیزیاش ده بێ پشتی یه کتری بخورێنن . ( Laver , 351 )

هه ر کۆمه ڵه شێوه و په یره وێکی بزاوتنی تایبه تی هه یه که له گه ڵ زماندا له مناڵیه وه ئه ندامانی کۆمه ڵ فێری ده بن ، له ده وره ی ـ کۆمه ڵه که ، له وانه یه ئه م پێره وه نامووسه یر بێته به رچاو وخه ڵکی تر تێ ی نه کات . بۆ نموونه ،ئەوانه ی خه ڵکی ئه مریکای سه رووبێن له وانه یه له وه نه گه ن که لووت خواراندن له ناو ئه م گه لانه دا نیشانه ی باوه ر نه کردنه . بزاوتنی ده م وچاو وبرۆ ولێو به پی ی جینسیش ده گورێ ئاشکرایه که له کۆمه ڵی ئێمه دا ژن زیاتر له پیاو له ئاخاوتندا که ڵك له بزاوتن وه رده گرێ .

هه ر چه نده ئه م ره وشتانه به فێربوونه ، به ڵام پاش ماوه یه ك ده بنه خوولـه مرۆڤدا ونه ...ست به کردنیان ده کرێ ونه ده ناسرێنه وه . بـۆ لێکدانـه وه وشی کردنه وه ی زمانی مرۆڤ پێـویستمان بـه وه ده بێ له م پێـره وه ناسـه ره کیانـه ش بکۆڵینه وه چونکه ئه مانه ش ( پێره وی ده نگی په ره زمانی وبزاوتن ودوورو نزیکی ) هه روه ك زمان به فێربوون له نه وه یه که وه بۆ یه کێکی تر ده چن و شان به شانی زمان به کاردێن .

په یوه ندی زمانی مرۆڤ به گلوبی هات وچۆوی شاره کانه وه :

هه موو زمانه وانه کان سه ربه هه ر رێبازێکی زمانه وانی بن له سه ر ئه و بیره رێك ده که ون که زمان کۆده ( شیفره یه ) . کۆد بریتی یه له ژماریه ك که ره سه که ده توانرێ له یه ك بدرێن بۆ به رهه م هێنانی که ره سه ی نوێ ی ئالۆزتر له زماندا کۆده کان ئه و که ره سانه ن ( یان ئه و فۆرم یان ده نگ یان پیتانه ن ) که توانای ئه ویان تێدایه له یه کتر بدرێن وله پال یه کتریدا ریزبن بۆ ئه وه ی فـریزو رستـه ووشه و دانه ی تریان لێ بێنه به رهه م . کاتێ به م کۆمه له فۆرمه ده وترێ کۆد که واتادارین یان واتایان هه بێ . جگه له مه ش مه رجه کۆد بۆ پـه یوه نـدی کردن له گه ڵ خه ڵکی تردا به کاربێت .

دیسان زۆربه ی زمانه وانه کان ئاسایی زمان به پێـره ویکی داخراو داده نـێن ئه گه ر ته نیا بۆمه به ستی لێکدانه وه وشی کردنـه وه ش بێت ، پێره وه کـه وه ك پێره وی بیرکاری له ناوه وه رێکه و ورده وئالۆزه وله ده ره وه ر داپچراوه به واتای ئه وه ی نه کارده کاته سه ر ده ره وه رو نه له ده ره وه ره وه کاری تی ده کرێ .

ئه گه ر ئه م دووبیره مان ده رباره ی هه ڵکه وتی زمان به لاوه په سه ند بی ، به واتای ئه وه ی زمان به کۆد دابنێین ووه ك پێره ویکی داخراو سه یری بکه ین ، ئه وسا تێ ده گه ین که له زۆر رووه وه زمان لـه گلوبی هات وچـۆی ناوشـار جیا نابێته وه وئه و به شانه ی زمان پێك دێنن هه ر ئه وانه ن که له گلوبی هات وچۆوی ناوشارداهه ن وکه لکیان لی وه رده گیرێ واله خواره وه به وردی لـه م به شـانه ی هه ردوو پێره وه که ده دوێین وجیاوازی ولێکچوونی نێوانیان پیشان ده ده ین : ـ ) ( Strang , 962 , 9 ( ۱ ) پێـره وی زمـانی مـرۆڤ بـه لای بـه شی زۆری زمانه وان کانه وه له چه ند به شێکی وه ك ئه مانه ی خواره وه پێك دی :

أ ـ سینتاکس ( ده ستوری ریز کردن و دانه پال یه کتری که ره سه کان ودیاری کردنی ئه و لێکدانانه ی که په سه ندن له زمانێکدا ) .

ب . سیمانتکس ( واتا دانان بۆ لێکدانه په سنده کان ) .

جـ ـ پراکماتیکس ( ئه و ده ستوورانه ی که لێکدانه په سنده کان له گه ڵ ره وشتی کۆمه لایه تیدا گرێ ده دات ) .

( ٢ ) پێره وی گلۆپی هات وچۆش دیسانه وه هه ر ئه م به شانه ی تێدایه به دی ده کرێ :

أ ـ سینتاکس ( یاسای ده ستووری لێکدان وریزکردنی سی ڕه نگه سه ره کی یه که : سور ، زه رد ، سه وز ) که له سێ یاسادا کۆده بێته وه : ( ١ ) ره نگه کان هه ریه که به ته نیا به کاردێن وبه پێچه وانه ی ئیشاره ی هات وچۆی هه ندی شوێنی تر ، نابێ تێکه ل بکرێن . ( ٢ ) ری ره وی گوران ته نیا ریگه یه کی هه یه : سه وز ـ زه رد ـ سور ( ٣ ) ئه م ریزبوونه به م پی یه هه ر دووپات ده بێته وه .

ب ـ سیمانتکس : ( دانانی واتا بۆ لێکدانه په سه نده کان واته بو ده نگه کان : لێره دا به سێ یاسا ئه م ئه رکه جێ به جێ ده کرێ :

( ١ ) سور = وه ستان

( ٢ ) زه رد = په له که ده بێ به سوور

( ٣ ) سه وز = ده رچوون ( بو شوفێر )

جـ ـ براگماتیکس ( گرێدانی لێکدانه په سه نده کان لێره دا سوور و سه وز و زه رد به وره وشته کۆمه لآیه تییانه ی که شوفێرێك ده بێ بیکات . دیسانه وه ئه مه ش له چه ند یاسایه کدا کۆده بێته وه ( ١ ) ئه گه ر گلۆپه که سوور بوو : ـ شوفێر قاچ له به نزین هه ل ده گرێ له ئاوینه که وه سه یر ده کات تا دلنیا بێت سه یاره که ی دوایه وه لێی نادات ، به ده ست ئیشاره تی هێواش کردنه وه ده دات ، پێ له سه ر بریك داده نی به کلاجدا . گێر ده گورێ بۆ قورستر . . هتد ( ٢ ) ئه گه ر گلوپه که سه وز بوو ، شوفێر که مێ له خێرایی خۆی که م ده کاته وه وئاسایی تێ ده په رێ . ( ٣ ) ئه گه ر گلۆپه که زه رد بوو ده بێ ( أ ) یان په له بکات ده رچی یان ( ب ) خێرایی که م ده کاته وه تا گلۆپه که ده بێته سوور وئه وسا ره وشته کانی ( ١ ) ی سه ره وه جێ به جێ ده کات .

له م به راورد کردنه دا ئه م خالآنه ی خواره وه شایانی لێکولینه وه ی گـرنگی پێدانن : ـ

١ . بوونی که ره سته کان له هه ردوو پێره وه که دا په یوه ندی به ئاره زوو خواستی ئه و خه لکه وه هه یه که پێره وه که یان داهێناوه وبه کاری دێنن . به واتایه کی تر زمان خه لك کرده و هه روه ك چۆن ده توانین له برِی ره نگی زه رد ره نگێکی تر له

گلوبه که دا به کاربێنین ، هه روه ها ده شتوانین ، ئه گه ر [illegible] که رێکه وی ، له کوردیدا هه موو ده نگێکی ( ر / بگوڕێن به / غ / له هه ر [illegible]ێکی وشه دا هات به بێ ئه وه ی زمانه که بشێوی . دیسانه وه هه روه ك گـو[illegible]ی ره نگه کـان تاماوه یه ك ئاسایی نایه ته به ر چاوی خه ڵکی ، گۆڕینی ده نگێکیش له زمانه که دا ماوه یه کی ده وی تا خه لکه که له گه لیدا رادێن وهه ر له وماوه یه شدا گۆڕینه که ده درێته به ر پلاروره خنه . چاکترین به ڵگه بۆ ئه م راستی یه زاراوه ی نۆی یه که بۆماوه یه کی دووروو درێژی بارێکی ناهه مواری هه یه له زمانه که دا و هه موو کاتی له وانه یه فری بدرێته ده ره وه .

٢ . لێکدانی ره نگه کان ولێکدانی ده نگه کانی زمان دیسانه وه به ویست وخواست وبریاری خه ڵکه که . ده توانیت ، بۆ نموونه ، له گلوبی هات وچۆدا له بری زه رد ، سه وزو سوور تێکه ڵ که ین وه ك لـه هه نـدی ولاّتدا ده کـرێ . هه روه هـا له زمانیشدا ، ده توانین ده نگی / ك / و / ا / و / ت / له یه کتر بده ین ، کات و تاکیان لێ به رهه م بێنین وه ك له کوردیدا کراوه . له هه مان کاتیشدا نه یه ڵین ئاتك ) بێته به رهه م . هه روه ها ، ده توانین رێگه به هه ندی لێکدان بده ین و هه ندێکی تر قه ده غه که ین وه ك ) ٢ ) و ( ٤ ) خواره وه :

( ١ ) زۆر جار به عه زه بی قسه ده کات .

( ٢ ) قسه ده کات به عه ره بی زۆرجار

( ٣ ) به عه ربی قسه ده کات زۆر جار

( ٤ ) قسه به عه.ره بی زۆرجار ده کات

٣ . دانان وهه ڵبژاردنی واتاش بۆ که ره سه یه سه نده کان دیسانه وه له خۆوه یه ویه ئاره زووی کۆمه ڵه . ( سوور ) ده بێ بۆچی بۆ وه ستان ببێته نیشانه ؟ ئایا له به ر ئه وه یه که ( مه ترسی ) پیشان ده دات ؟ ( سوور )بۆچی ده بێ ( مه ترسی ) پیشان دات ؟ ئایا له به رئه وه یه ( خوێن ) و ( ئاگر ) سوورن ؟ به لاّم بۆ ده بێ ( خوێن ) و ( ئاگر ) پر مه ترسی بن ؟ خۆبه بێ خوێن که س نازی و بێ ئاگریش مرۆڤ هه رگیز گه شه ی نه ده کرد . . . . .

له مه ش سه یر تر هه ڵبژاردنی ( سه وزه ) به نیشانه ی ( ده رچوون ) و ( زه رد ) بۆ خۆ ئاماده کردن .

ئه نیا جیـ ـی له نێوان زمانی مرۆڤ وگلۆپی هات وچۆوی ناو شاردا له وه‌دایه ( ۱ ) زمانی مرۆڤ ئاڵۆزتر وچالاکتر ووردتره و بۆ هه موو ئه رکێك ده ست ده دات له به ر ئه وه ی که ره‌سه کانی زۆر ده وڵه مه ندتره و ( ده نگـه کانی ) ، لێکـدانی که ره سه کانی ئاڵۆزتر وتێرتره وپێویستی به سه دان وهه زاران یاساو ده ستـووری زیاتر . ( ۲ ) پێره وی گلۆپی هات وچۆ وده توانرێ وه ك په یره وێکی داخراوسه یر بکرێ ، چونکه په یوه ندی نییه به سه یاره وه وله ژێرکاری ئه مانه دا نی یه . به ڵام زمان ئه گه ر بۆ لێکدانه وه وشی کردنه وه ش پێره وێکی داخراو دابنرێ ، له راستیدا خۆی به په یره وێکی کراوه ی وله ژێر کاری خه لکیدایه وکاریش ده کاته سـه ر بیری ئه وانه ی قسه ی پێ ده که ن . ( Strang , 9 ) .

## ئه رکه کانی زمان ( Functions of Language )

مه به ست له ئه رکه کانی زمان ئه و کارانه ن که مرۆڤ به هۆی زمـانه وه لـه کۆمه ڵدا جی به جی یان ده کات . ئاشکرایه ئه م کارانه هێند زۆر ئاڵۆزو ووردن هه روا به ئاسانی پۆلێن ناکرێن وهه رچه نـدێکیش هه وڵ بـده ین هه ر ئـاره زوو ده که وێته دابه شکردنیانه وه . له گه ڵ ئه مه شدا ده توانین بڵێین به گشتی زۆربه ی زمانه وانه کان ئه م ئه رکانه ده که ن به جه وت جۆره وه : ( Pyles / Algeo , 233 — 236 ) ۱ زانیاری ۲ هه واڵ گه یاندن ۳ پرسیارکردن ۴ هه ست ده ربرین ، ۵ وروژاندن ۶ فه رماندان ۷ رابه راندن وجێ خۆش کردن .

زانیاری یان هه واڵ گه یاندن به ئه رکێکی هه ره سه ره کی زمان ده ژمێری وئه و به کارهێنانانه ی زمان ده گه رێته وه که به هۆیه وه مرۆڤ له ده ورو به ری خۆی ودیارده کانی ده ورویشتی ده‌دوێ . هه واڵ گه یاندن په یوه ندی به ( زانین ) وهۆش مرۆڤه وه هه یه له به ر ئه مه له هه موو به شه کانی زانستی دا ئه م‌به‌کارهێنانه زۆره .
له زانیاری یان هه واڵ گه یاندنیدا قسه که ر ده یه وی بوون ونه بوونی یان راستی و ناراستی دیارده کات پیشان بدات ، هه ر له به ر ئه مه یه که ئه و رسته یه ی هه واڵ گه یه نه ده بێت له هه ڵکه وتدا یان راست یان‌هه‌ڵه بێت ، به واتایه کی تر ده بێ له و جۆرانه بێت که بتوانن یان راستی یه که ی بسه لمێنین یان به درۆی بخه ینه وه وه ك :

١ . ئاو له پله ی سفردا ده به ستێ وله پله ی سه دا ده کوڵێ
٢ . مه م وزین به یه ك ناگه ن
٣ . به شی زۆری دانیشتوانی ئه م شاره بێ ئاگان

بێ گومان ئه و گوتنانه ی هه واڵ گه یه نن مه رج نی یه هه مویان راست بن ( بروانه رسته ی سێیه م که زۆر به گران راستی یه که ی ده سه لمێ ) به ڵکو له وانه ی درۆ بن یان بۆچه‌واشه کردن بێت . له مه دا رسته ی هه واڵ یان هه واڵ گه یه ن له رسته ی پرسیارو ( وه ك : تۆکیی ؟ )فه رماندان و ( وه ك : ئه وپاره یه م بده رێ )سه رسورمان ( به خوا جوانه ) جیاده بێته وه . ئه م جۆره رستانه ( فه رمان و پرسیارو سه رسورمان ) نه راستن ونه درۆ . راستی وناراستی تـه نیا لـه رسته ی هه واڵ گه یه ندا سه رهه ڵ ده دات .

مه به ست له پرسیار کردن ده ست خستنی زانیاری یه ، به واتای ئه وه ی به هۆی پرسیار کردنه وه قسه که ر ده توانی که لێنی یان چه ند که لێنێك له زانیاري خوی دا به رامبه ر دیارده یه ك پر بکاته وه . له مه دا پرسیار کردن پێچه وانه ی هه واڵ گه یاندن ده وه ستێ چونکه رسته ی هه واڵ گه یاندن زانیاری ده گه یه نێ یان بلاوی ده کاته وه وسه رچاوه ی زانیارییه که ش قسه که ره له رسته ی پرسیاردا پرسیارکه ر گوێگر یان خوێنه ر به سه رچاوه ی ئه و زانیاریی یه دا ده نێ که لای ئه م ده ست ناکه وی بۆ نموونه . پرسیارکه ر کاتێ ئه م پرسیارانه له گوێگر / خوێنه ر ده کات که خۆی وه رامیان نه زانی .

که ی سینه ما به تاڵ ده بی ؟ ( ساعات حه وت )
چۆن چێوه ی چوارگۆشه ده دۆزینه وه ؟
( درێژی لایه کی × ٤ )
ئه وه کی یه له وبه ره وه وه ستاوه ؟ ( کوره که ی مام هۆمه ره )

له سه رێکی تره وه ، رسته ی هه واڵ گه ین وپرسیار کردن له یه ك ده چن ، چونکه هه ردوکیان له باره ی ( زانین ) هۆشه وه‌ن ، هه رچه نده رسته ی هه واڵ گه یه ن ، هه روه ك له سه روتره وه پیشانمان دا ، ده رباره ی ئه وزانیارییه کـه قسه کـه ر لایه نێ ورسته ی پرسیاریش به پێچه وانه وه ، له و زانیارییه ده‌دوێ که لای گوێگر / خوێنه ر ده ست ده که وێ . رسته ی هه واڵ گه یه ن وپرسیار ، له به ر ئه وه ی

هه ردووکیان ده رباره ی زانینن ، به شێوه یه کی گشتی به ته واو که ری یه کتری داده نرێت چونکه به هه ردووکیان جوتێك پێك دێنن .

رسته یان گوتن کاتی بۆ هه ست ده ربرین به کاردی که هه ست و ئاره زوو باوه ری قسه که ر به رامبه ر دیارده کانی ده ورووبه ری ده رخات ساده ترین جۆری هه ست ده ربرین له و گوتنانه دا ده رده که وی که سه رسورمانی تێدایه وه ك :

خالق ، چه ند جوانه !

ئاخ ، ده ستم ناگاته قورنمی !

نه فره تی خوای لی بی !

ئۆف ، چه ند جاری پی ده لێم وامه که .

زۆربه ی کات ئه م وشه هه ست ده ربرانه له گه ڵ گوتنی تردا کۆ ده بنه وه و له گوتنه که ده که ن زیاتر له ئه رکێکی هه بی . بۆ نموونه جیاوازی نێوان رسته ی ١ ورسته ی ٢ ی خواره وه له وه دایه که رسته ی یه که م هه واڵ گه یه نه ، به لام دووه م نه ك هه ر هه واڵ گه یه نه به ڵکو هه ست ده برپشه چونکه به ته واوی هه ستی قسه که ی به رامبه ر که ره که ده رده بری :

١ . ئه م که ره به هه زار نه قیزه ناجووڵێ .

٢ . ئه م که ره بی خێره به هه زار نه قیره ناجولێ .

ئه و رستانه ی بۆ جنێودان به کاردێن له گه ل ئه و وشانه ی بۆ پیا هه ڵدان به کاردێن (وه ك : ـ نامه رد ، که ره ، به رز ، باش ، . . . هتد ) ـ هه ردکیان بۆ ده ربرینی هه ست و ئاره زوو له کایه دان ، هه ر له به ر ئه وه شه که ده ربرین له دوو شێوه دا ده بی : شێوه ی سه لبی وشیوه ی ئیجابی : ـ

خوایه چۆن داکێکه .

خوابتباته وه بۆچی منالێکی .

گوتنی هه واڵ گه یه ن له وه دا له گوتنی هه ست ده ربر جیا ده بێته وه که تێیدا قسه که ر له باره ی ده ورویه ره وه ده دوێ ، راست بێت یان درۆ له ئه رکی هه ست ده ربرین داگوتن ده رباری هه ستی قسه که ره و ده رباره ی خۆی یان دیارده کانی ده وری خۆی دا ده نی به شێوه کی سه لبی یان ئیجابی .

کاتێ زمان بەئەرکی ورووژاندن بە کاردی کە هەست و ئارەزووینەکی تایبەتی لە گوێگر / خوێنەردا دروست بکات . بەواتای ئەوەی گوێگر بورووژێنی ، دڵی خۆش کات یان راپەڕێنی و هەڵی بدات و ملی بشکێنی . ئەم بە کارهێنانەی زمان لە نوکتە گێرانەوە و پروپاگەندە و تراجیدیادا زۆرتر دەردەکەوێ . ئەو گوتەی کە دایك ساواکەی پێ ژیر دەکاتەوە و ئەو گوتەی کە قسەکەرێکی رامیاری یان دینی خەڵکی پێ دەورووژێنێ ، ئەو گوتنە کە لاوێك یارەکەی پێ دڵ خۆش دەکات ، ئەمانە هەموویان نموونەن دەربارەی زمان بەکارهێنان بە مەبەستی ورووژاندن یان خۆش کردنی هەست لە گوێگریان خوێنەردا .
ئاشکرایە کە بەکارهێنانی زمان بۆ هەست دەربرین و هەست ورووژاندن دەتوانری بە یەك ئەرك دابنری چونکە هەست دەربرین و هەست ورووژاندن زۆر لە یەکترەوە نزیکن ، بەلام زۆربەی زمانەوانەکان وای بە باشتر دادەنێن کە لە یەکتری جیا بکرینەوە چونکە لە دوو روانگەی جیاوازەوە دێن . لە هەست دەربریندا ، بە پێچەوانەی ورووژاندنەوە ، قسەکەر دەربارەی هەستی خۆی دەدوێ و دەیکات بە باس ، بەڵکو بەدوای ئەوەدا بگەری کە هەستێك لە گوێگر : دروست بکات یان وای لێ بکات هەلوێستێکی تێدا دروست بێ .
هەرچەندە ئەم جۆرە بەکارهێنانەی زمان بە تایبەتی لە پروپاگەندەدا دەردەکەوێ ( پروپاگەندەی رامیاری و بازرگانی ) بەلام وەنەبێ لە کاری ئەدەبیشدا سەرهەڵ نەدات .
کاتێك زمان بۆ فەرماندان بە کاردێ کە قسەکەر دەیەوێ کارێك بە گوێگر راپەڕێنی ئەرکی فەرماندان لەوەدا لە ورووژاندن جیا دەبێتەوە کە تێیدا قسەکەر دەیەوێ گوێگر بە کارێك هەستی نەك هەستێکی تێیدا دروست بێت یان هەلوێستێکی دیاری کراوی تێیدا سەرهەڵدا . سادەترین فەرمان لە شێوەی داخوازیدە دەبێ وەك :

فەرموو دانیشە .
یاچایەکت بۆ بانگەکەم
پیاڵەیەك چام بۆ لێنی .

هه ر چه نده فه رماندان به زۆر ریگا ده بی ، بلاوترین شێوه ی ئه و جۆره یه که به هوی رسته ی فه رمانییه وه ده ربیرریت وه ك :

وه ره ده ره وه .

مه یه ژووری [٧]

ئاشکرایه که زۆر گوتنی تریش هه ربه مه به ستی فه رماندان دێن هه رچه نده له رواڵه تدا ( له رووی فۆرمه وه ) له گوتنی فه رمانی ناچن وه ك :

ده بێ مناڵ له گه ڵ خۆتان نه هێنن .

نه که ی ئازاری خه ڵکی بلده یت .

پێویسته خه ڵکیت خۆش بوی .

باتا زووه ده رچین .

(٤) ئه رکی راپه راندن له وگوتنانه دا ده رده که وی که خۆیان بریتین له راپه راندنی کارێك ، به واتای ئه وه ی له جیاتی ئه وه ی قسه که ر کارێك به گوێگر راپه رێنی ، خۆی کاره که راده به ریێ و گوتنه که شی راپه راندنی کاره که یه . بۆ نموونه . که مه لایه ك له کاتی ناوناتی منداڵێکدا ده لی ئه وا ئه م منداڵه مان ناونا هه ژار ئه وا گوتنه که خۆی راپه راندنی کاره که یه . که بریتیه له ناوناتی منداڵه که . نموونه ده رباره ی ئه م ئه رکه ی زمان زۆره وه ك :

سوێند ده خۆم راست بڵێم

به ڵێن ده ده م ئه وکاره ت بۆ بکه م .

گره و ده که م ده رناچیت .

وا ئه م کۆبونه وه یه دوای پی دێنم .

ئه وگوتنانه ی ئه رکی را په راندن ده نوێنن چه ند تایبه تیه کیان تێدایه وه ك : ( ١ ) بکه ری کاره که ئاسایی که سی یه که می تاك وکۆیه . وه ك من / ئێمه . . . . ( ٢ ) ئه وکارانه ی له م جۆره گوتنانه دا ده بینرێن کۆمه ڵێکی دیاری کراوی داخراون وه ك : ناونان وبه ڵێن دان . . . . .

وه ك ئه رکی هه واڵ گه یاندن و ده ربرین ، ئه رکی راپه راندن له روانگه قسه که ره وه دیاری ده کرێ ، به واتای ئه وه ی که قسه که ر تێیدا ده بێ به کارێك هه ستی به پێچه وانه شه وه ، له ئه رکی فه رماندان و پرسیار وورووژاندندا ، گوێگر

دێته به ر ڕۆشنای ... چاوه ڕێ ی ... ده کرێ یان به کارێك هه ڵبێ
(فه رمان ) یان ... تێدا ... ووژاندن ) یان زانیارییه ك بدات به
قسه که ر ( ... به م ... جۆره به ... ێنانه ی زمان
کۆمه ڵه یه کی ... جیا ده بنه وه که
هه ر کۆمه ڵه ... ) له ڕوانینی
دووکه سی جیا ... گر ) وه ك له م
نه خشه یه دا ...

ی ڕوانین

| بابه ت | قسه که ر | گوێگر / خوێنه ر |
|---|---|---|
| ١ . هۆش ( زانین ) | هه واڵدان | پرسیارکردن |
| ٢ . هه ست ده ربڕین | ده ربڕین | وورووژاندن |
| ٣ . کار | راپه ڕاندن | فه رماندان |

نموونه :

١ ـ سبه ینێ دێم بۆلاتان ( هه واڵدانه ، قسه که ر هه واله که ده گه یه نێ له باره ی زانینه وه یه ) .

٢ ـ که ی دێت بۆ لامان ؟ ( پرسیاره ، گوێگر ده بێ که لێنێکمان بۆ پڕکاته وه ، ده رباره ی زانینی گوێگره ) .

٣ ـ به خوا منالێکی چوختی و سه رسه ختی . ( هه ست ده ربڕ ، قسه که ر هه ستی خوی ده رده بڕی ، له باره ی هه سته وه یه ) .

٤ ـ ئێوه ی قوتابی ( وورووژاندن ، مه به ست دروست کردنی هه ست له گوێگردا (قوتابی یه کان ) ، ده رباره ی هه سته ) .

٥ ـ ئه وا به ناوی خوای گ... ئه م کۆبونه وه یه ... ... دپنین . . .
(رایه راندن ، قسه که ... هه ڵ ده ستی ... که یه ، له باره ی کاره وه یه ) .

٦ ـ ئه و ده رگایه بکه رد وه ( ئه رماندان ... ... کاره که ده بێ هه ستی ، له باره ی کاره وه یه ) .

دوا ئه رکی زمان ، ئه رکی جێ خوشکردن ، له و ئه رکانه یه که زۆر بلاوه و له هه موو زمانیکی سروشتیدا هه ست به بوونی ده کرێ ئه م ئه رکه ( که ده شتوانین پی ی بلێین ئه رکی کومه لایه تی زمان ) زیاتر لـه و گوتنـانه دا ده رده کـه وی که رۆژانه به ... و به ... ر زاری هه موو که ... که وه یه بۆ مه بـه ستی خۆبـردنه پێشه وه وباروشوێن خۆشکردن و خۆچه سپاندن ... کومه لگای مرۆڤدا وه ك ئه و گوتنانه ی بۆ سلاو کردن ( خوا حافیزی وچاك وچۆنی به ... ( ... ... . چونی ؟ جیاکی ، باشی ، شه وباش ، سوپاس ، خوات له گه ڵ ، شه وێکی شاد . . . . ) ئه م گوتنانه هه ر چه ند زۆربه یان له شێوه ی پرسیارداں ، له راستیدا بۆ پرسیار کردن نایه ن به لکو قسه که ر بۆ ئه وه به کاریان دێنی که خۆی له گوێگر نزیك بکاته وه وشوێنی خۆی له رووی کۆمه لایه تیه وه بچه سپێنی ، به لگه مان بۆ راستی ئه م باوه ره ئه وه یه که له یه کیك ده پرسین چۆنی ؟ چاکی ؟ به ته مای ئه وه نین گوێگر له وه لامدا باسی نه خۆشی وناخۆشی خۆیمان بۆ بکات . گوتنه که ته نیا بۆ ئه مه یه پیشانی بده ین که گوێگر ده ناسین و په یوندیمان له گه لیدا هه یـه و هیچ ناکۆکیه ك له نێوانماندانی یه زۆربه ی ئه م گوتنه کۆمه لایه تیانه له وانه یه راستیش نه بن به لام ئیمه ره خنه یان لێ ناگرین چونکه له بنه ره تدا بۆ هه والّ گه یانـدن به کار نایه ن . به لکو بۆ بارخوشکردنه و به هویانه وه ده توانین ساغی بکه ینه وه کێ له گه لماندایه وکی نه یاره ، هه ندی سروود وگورانی ئایینی ورامیاری ده چنه ناو ئه م جۆره به کارهێنانه ی زمانه وه چونکه مه به ستی سه ره کی له به کارهێنانیان جیاکردنه وه ی یارو له یاروو چه سپاندنی بیروباوه ری کومه لێکه له ناوکۆمه لانی تری مرۆڤدا . ( Pyles , Algeo , p235 )

له گه ڵ ئه وه شدا که هه ندی ئه رك له گه ڵ هه ندی شێوه ی رسته دا رێك ده که ون و شانی به شانی یه کتر ده رۆن ( پرسیارکردن له گه ڵ رسته ی پرسیاردایین

فه رماندان له گه ل رسته ی فه رماندا ، بۆ نموونه ) شێوه ی رسته به گشتی نیشانه یه کی به که ڵك نی یه بۆ جیاکردنه وه و پۆلێن کردنی جۆری به کارهێنان . بۆ نموونه هه موو ئه م رستانه ی خواره وه له رواله تدا پرسیارن، به ڵام ته نیا ئه وه ی یه که میان به راستی پرسیاره دوانه که ی تر فه رمانن به ڵام به شێوه ی پرسیار ده ربراون :

١ . ئایا ئاو له پله ی سفردا ده یبه ستێ ؟

٢ . ئه و شه کره م ناده یتێ ؟

٣ . توزی ناچیت به ولاوه ؟

بۆ ئه وه ی چاك له به کارهێنانی زمان بگه ین ده بێ نه ك هه رگوێ بده ینه فۆرم یان رواڵه تی رسته یه ك به ڵکو ده بێ بارودۆخی قسه که و قسه که رو گوێگر لێك بده ینه وه و ده بێ به ته مای ئه وه ش بین به تایبه تی له ئاخاوتندا که مه به ست به پێچه وانه ده ربری . هه ندێ جاریش شتێك ده ڵێین و مه به ستمان شتێکی جیاوازه . بۆ نموونه ، له کاتی نان خواردندا که روو ده که ینه میوانه که مان و ده ڵێین قابه که ت هیچی تێدا نی یه ئه وه مه به ستمان ئه وه نی یه که هه واڵیکی بده ینی یان راستی یه کی پێ راگه یه نین ، به ڵکو رسته که مان ته نیا له رواڵه تدا هه واڵ گه یه نه . له راستیدا ده مانه وی بزانین میوانه که رێگامان ده دات قابه که ی بۆ پر له خواردن که ین . که واته رسته که مان له راستیدا پرسیاره نه ك هه واڵ گه یه ن و ته نیا بۆ رێزلێنان خستوومانه ته قاڵبی رسته یه کی هه واڵ گه یه نه وه له پۆلین کردنی گوتنندا ده بێ وریا بین وچاك گوی بده ینه بارودۆخی قسه تاکه مه به ستی به رامبه ره که مان بگه ین و نه که وینه هه ڵه وه .

شایانی تێ بینی یه که له هه ر پارچه گوتنێك یان نووسینێك ورد بینه وه ده بینین زیاتر له ئه رکێك پیشان ده دات بۆ نموونه ئه گه ر بمانه وی وتارێکی ئایینی شی بکه ینه وه ده بینین له ..ه موو جۆره رسته یه ك یان گوتنێکی تێ ده که وی . هه ندی له م گوتنانه هه واڵ گه یه نن ( وه ك ئه وانه ی که راستی رووداوه ئاینیه کان ده گه یه نن ) ، هه ندێکی تریان پرسیارو فه رمانن . دیسان هه ندی گوتنی له وانه یه هه ستی قسه که ر ده ربری یان گوێگران بورووژێنی . ته نانه ت له وتاری وادا جێگه ی گوتنی کۆمه ڵایه تیش ده بێته وه وه ك له و کاتانه دا که خاوه ن وتار به گوێگره کانیدا هه ڵ ده داو ستایشی ره وشتیان ده کات ( Pyles , Alyeo, P. 237

## زمانه وانی هێماکاری

### ١ . سه ره تا :

زمانه وانی بریتی له لێکدانه وه‌یه کی زانیارانـه ی زمان مـرۆڤ و له ویـابه تـه مرۆڤیانه یه که له لایه که وه ده که وێته سه ر سنووری چه ند زانـ.تی یه کی وه ك کۆمه‌ڵناسی و زانستی ده روون مێژ ووئه ده ب و له لا یه کی تریشه وه . که لُك له زانیاری بایـۆلۆجی و نیـورولۆجی و فیـزیاو بیـرکاری و لـۆجیك وزانستی هێـما (هێمالۆجی ) وه رده گرێ .

ئه م بابه ته ی دوایی . هێمالۆجی ، په یوه ندی یه کی پته وی له گه ل زمانه وانی دا هه یه . جونکه هه ردوو زانیارییه که پشت به هێما ده به ستن وبریتین له لێکدانه وه ی پـه یوه نـدی فۆرم و واتـای هێما تـاکه جیـاوازییان لـه م رووه وه . له وه دا یه که هێمالۆجی وه ك زانستێك خـه ریکی لێکدانـه وه ی هه مـوو جۆره په یره ویکی هێمایی یه و ده وی په یوه ندی نێوان فۆرم و واتای هه موو هێمایه ك ئاشکرا بکات و بزانی ئه م په یوه ندی یه ریکه یان نارێك ، راسته وخویه یان ئاراسته و خۆ هه رچی زمانه وانی یه ، ته نیا خه ریکی لێکـدانه وه ی جـۆریکی تایبـه تی هێمایه ، ئه و جۆره ی له زماندا کارده کات ( هێمازمانی یه گـان ) و ـ ده یه وێ سروشتی ئه م په یوه ندی فۆرم و واتایه له مانه دا دیاری بکات .

### ٢ . هێماکاری له ژیانماندا به گشتی :

گیانه وه ر له ناو خۆیاندا زۆر .ار له سه ر ئاو خواردن و شوێن و سه رکردایه تی شه رده که ن . مرۆڤ ، به پێچه وانه وه ، نه ك ته نیا له سه ر ئه م شتانه خۆیان به ڵکو له سه ر ئـه و هێمایـانه ش کـه خۆی بـۆ ئه م شتـانه ی داده نی هـه میشه له شانه کی دان ، ئه وه ته مرۆڤ نه ك هه ر له سه ر خواردن به ڵکو له سه ر پاره (که هێمایه کی خواردنه ) نه ك هه ر له سه ر ده سه لات و سه رکردایه تی به ڵکـو له سه ر ئه ستێره ی سه ر شان و خه ت و ته خت ( که هێمایه کی ده سه لاتن ) یه کتری ده برێننه وه ، له کاتێکدا که هێمادانان بـه شێکی زۆر گرنـگ له ژیـانی

رۆژانه ی مرۆڤ و هه موو لایه نێکی گرتۆته وه ، دیارده ی هێمادانان زۆرکه م کاری کردۆته بوون و ژیانی گیانه وه ری ترو به ده گمه ن له ناویاندا هه ست به بوونی ده کری . هه ر له به ر ئه مه شه که زۆر شاره زا له و باوه ره دان که هێما به کارهێنان زیاتر له هۆش و زمان و هه ستی کۆمه لایه تی مرۆڤ له گیانه وه ر جیاکردۆته وه .

هێمادانان بریتی یه له و کاره ی که تێیدا مرۆڤ به ئاره زوو و خواست و ویستی خۆیان ده توانن له ناو خۆیاندا پێك بێن شتێك دانێن به هێما بۆشتێکی تر . ئه م هه ڵ و مه رجی پێك هاتنه ش له و کاتانه دا دێته کایه وه که دوو که مرۆڤ یان زیاتر به یه کتر ده گه ن و ده یانه وی ژیانی خۆیان رێك خه ن(Hayakawa , 1974,24 )

هه روه ك له پێشتره وه رووغان کرده وه هێمادانان و هێما به کارهێنان هه موو لایه کی ژیانی مرۆڤی گرتۆته وه . بۆ هه ر لایه ك ده چین ده بینین ئه م هێماکاری یه له کاردایه و که ڵکی لیٚ وه رده گیری تاج و ئه ستێره ی سه رشان و خه تی سه رباسك و ملوان هێمان بۆ پایه ی سه ربازی ، ئه موستیله و بازن و گواره و پشتێن و گۆبه رۆکی زێر هێمای ده وله مه ندین و جلی تایبه تی هێمایه بۆ ئه ندامێتی کۆمه لێکی دیاری کراو هه روه ك چۆن سه ربازو پزیشك و پۆلیس و برین پێچ و پاشاو پیاوی ئایینی به هۆی جله کانیانه وه ده ناسرێنه وه چونکه به رگه کانیان هێمایه بۆ ئیش و کاره که یان . نه ك هه ر له به رگ هه ڵبژاردندا به ڵکو له خواردن و ته نانه ت ناوماڵیش دا هێماکاری هه یه و که ڵکێکی زۆری لی ده بینری بۆ نموونه ، لای موسلمانان برنج و گۆشت لێنان لەئێوارانی هه ینی وشه وی مه ولوددا هێمایه بۆ موسلمانێتی راست ، هه روه ك هێنانه وه ی میوان له شه وی وادا هێمایه بۆ یه کسان و نه بوونی جیاوازی چینایه تی . دیسانه وه هه ڵبژاردنی ناوماڵیش هێمایه بۆ پایه و چینی کۆمه لایه تی خاوه ن ماڵ . له هه ندی چیندا ، بۆ نموونه ، گۆرینی سه یاره له به ر باشی خراپی یان کۆن و نویی مودیله که نی یه به ڵکو هێمایه بۆ چین و پایه ی کۆمه لایه تی خاوه نه که ی .

له هێماکاری دا پێویستمان به وه ده بێت که سێ خاڵی سه ره کی له یادنه که ین

١ ـ مرۆڤ هه موو کاتی توانای ئه وه ی هه یه به ها ( نرخ ) یان هێما بۆ شته کانی ده وروبه ری دابنی وبیان داته پاڵ هه ر شتێك که خۆی بیه وی . بۆ نموونه ، ئێمه ی مرۆڤ ده توانین له ناو خۆماندا رێك بکه وین وهێمای ( س ) و ( ج ) له جیاتی ( کێو ) ، یان ( س ) بو ( هه ردی ) شاعیرو ( ج ) بو ( زێوه ر ) به کاربهێنین . ئه م

هێماكاری یه ( هه ر چه نده له خۆیدا ئاشكراو دیاره ) چه ند راستیه كمان بۆ روون ده كاته وه كه هێنده ئاشكرا نین وزۆر جار له یادمانا نین وهه ستیان پی ناكه ین :
أ ـ هێما له بنه ره تدا خاوه نی هیچ تایبه تیه كی خۆی نی یه ، له به ر ئه وه نه جوانه و نه ناشیرین ، نه خراپه ونه چاك ، نه له باره و نه ناله بار ، به ڵكو ئه م تایبه تیانه زۆر جار به هه ڵه ده درێته پاڵی وپاش ماوه یه ك له خۆشمان ده بێته راست .
ب ـ داهێنان وبه كار هێنانی هێما به نده به پێك هاتن ورێكه وتنی كۆمه ڵه ی خه ڵكه وه . به واتایه كی تر ، هێماكاری به بریاری كۆمه ڵ دێته كایه وه ومانه وه شی به نده به مانه وه ی ئه و بریاره وه وهیچ هێزێكی تر ناتوانی له ناوی به ری یان له باریزی كۆمه ڵه كه خۆی نه بێ ٧ .
په یوه ندی تی یه له نێوان شێوه ی هێماكه و ئه و شته ی به رامبه ری داده نری بۆ نموونه ، ریكه وته كه پایه ی سه ربازی له ناو كۆمه ڵی ئێمه دا خه ت و ئه ستیره و تاج نیشان ده دری ٧ وله هه ندی كۆمه ڵدا هه مان واتا به هۆی په ری ره نگاو ره نگه وه ده گه ینری .
د ـ له سه ره تای دانانی هێمایه كدا هه ندی جار هه ست به وه ده كری كه نامۆ وناله باره به لاّم به تیپه ربوونی كات ئه م نامویی وناله باری یه له ناو ده چی وتازیاتر بلاّو بێته وه باناوخه ڵكه كه دا وفراوانتر به كاربێت ، كه متر نامۆیی وناله باری پێوه دیار ده بێت وزیاتر ده چه سپی .
٢ ـ مرۆڤ نه ك هه ر ده توانی هێما بداته پاڵ شتێك ، به ڵكو توانای ئه وه شی هه یه كه هێما بۆ هێمای تردابنی بۆ نموونه ، هه ر له و نموونه ی ( ١ ) دا ، ئێمه ده توانین هێمای ( م ) له جیاتی هه موو سینه كانی سه ره وه ( ن ) له جیاتی هه موو جیمه كانی سه ره وه به كاربێنین به م جوره ( م ) یه كسان ده بێت له گه ل ( شه روال ، چیاو هه ردی ) و ( ن ) له گه ڵ ( كراس وكێوو زێوه ر ) . ئه م توانسته ، توانای هێمادانان بۆ هێمای تر هه ر له مرۆڤدا به م جۆره فراوانه هه ستی پێ ٧ ده كری ٩ وئه گه ر ، ئه م توانسته ی نه بووایه مرۆڤ نه ی ده توانی یه كێك له هه ره ده ستكه وته گرنگه كانی بهێنیته دی ، ئه ویش داهێنانی نووسینی فونه تیكی یه ، نووسینی فونه تیكی ( به هه ردوو جۆره كه یه وه ، نووسینی برگه یی وفۆنمی ) كه تێیدا پیت ده گۆرینه وه به ده نگ وبه ده نگ به واتا دووجار دووركه وتنه وه یه له ( واقع ) ، چونكه هێما ( پیت ) داده نێین بۆ هێمای تر ( فۆنیم ) . هه رچی جۆره كانی تری نووسینه ( نووسینی واتایی ـ بیری . بیت یان وێنه یی ) ته نیا پێویستی به وه یه كه هێما ( پیت ) بۆ شت ( واتا ) دابنێن ، له به ر ئه وه ، هه نگاویك كورتره ویه ك جار دووركه وتنه وه یه له (( واقیع )) ه

٣ ـ شایانی باسه كه واتایان ئه و به هایه ی ده درێته پاڵ هێمایه ك له كۆمه ڵێكه وه بۆ كۆمه ڵێكی تر یان له جیلێكه وه بۆ یه كێكی تـر ده گۆڕی . بـۆ نموونـه ، له لای چینه كانی سه ره وه ی كۆمه ڵ به رگی ئاڵ ووالآ وپێلاوی بازنه به رزو نینۆكی درێژ و تیژ هێمایه كی كار نه كردن وره نج بردنی خه ڵكی تره ، هه مان دیارده لای چینی نـاوه ندی ( بـه شی سه ره وه ی ) واتـایه كی تـری هه یـه ، ئـه ویش ئـه وه یـه كه ئه مـانیش هیچیان لـه وان كه مـتر نی یه هـه رچه نـده ئیش ده كه ن وخـۆیان به خێوده كه ن وبه ره نجی شانی خۆیان ده ژین .

كه م شت هه یه كه مرۆڤ ده ی كات یان ده یه وێ بی كات یان هه یه تی یان ده یه وێ ببێت كه جگه له به ها بایولوجی یه یان میكانیكیـه كه ی بـه هایـه كی هێماییش نه بێت ، هێماكاری له هه موو جۆره كـۆمه ڵێكی مـرۆڤانـه دا هه یـه و هه موو لایه نێكی ژیانی ئاده میزادی گرتۆته وه لەو كۆمه ڵـه هه ره پێش كـه وتوو وهه ره دواكه وتوكانیش دا هه ستی پێ ده كرێ . ( Hayakawa,P,22 ) .

ئاشكرایه كه هێمـاكاری تـاراده یه ك ژیـانی مرۆڤی ئـاڵۆزانـدووه وهه نـدی ره ووشتی ناپێویستی تێیاندا دروست كـردووه . هه ر ئـه مه شـه وای له هـه ندی له فه یله سـووفه كـان كردووه وابیـربكه نـه وه كه ژیـانی ئاژه ڵی تـر له بـه ركه م هێماكاری ساده ترو ئاسانترو سروشتی تره . زۆرجاریش ئاڵۆزی ئه م ژیانـه مان وامان لێ ده كات ئاوات به ئاژه ڵی تر بخوازین . به ڵام ده بێ ئه وه بزانین كه ئه م هێماكاری یه كه چه ندین ره وشتی ناپێویست وناژیرانه له مرۆڤدا دێنێته كایه وه ، هه ر ئه مه شه كـه بۆتـه هۆی دروست بـوونی زمان وهـه موو ئـه و ده ستكه وتـه گرنگانه ی كه مرۆڤ به هۆی زمانه وه چنگی ده كه وێ بێ گومان هه ر وه ك چۆن كێشه ی ده ست نه كه وتنی به نزین وده ست نه كه وتنی پارچه ی سه یـاره نابێت وامـان لێ بكات ئـاوات به و سـه رده مانـه بخوازین كـه سه یاره دانه هـاتبوو ، هه روه ها ئه م ره وشته ئاڵۆزو ناژیرو بێ مانایه ی كه هێماكاری هێناوویه ته ژیانی مرۆڤه وه نابێت وامان لێ بكات ئاوات به ژیانی ئاژه ڵ وگیانه وه ر بخوازین هه ر له به ر ئه وه ی ساده یه وئاسانه . چاره له وه دایه كه هه وڵ بده ین له هێماكاری بگه ین وه ك یه كێـك له و هـه زاران دیارده یـه ی له ده ورروبـه رماندا هه یـه ، هه ركاتی به ته واوی له هێماكاری گه یشتین ، ئیتر له مه ترسی ئه وه دا نابین كه به هه ڵه دا بچین وببینه كوێڵه ی هێماكاری وله سه ر په نجه ی ئه و بسـوورێینه وه

ویمان خه لـه تێنی هه ر وه ك ئـه و پیـره ژنـه ی كـه نـه ی ده زانی شـانوگـه ری هێماكاری یه وسه ری له وه سوورمابوو چۆن پاله وانیك كه ( له چیـرۆكێك دا ) كوژرا جاریكی تر ( له چیروكێكی تردا ) زیندوو ده بێته وه . وه نه بێ هه ر مروڤی ساویلكەو نه خـوینده وار بكـه وێته هـه ڵه ی واوه بـه ڵكو زۆر جـار ته نـانـه ت خوێنده واری به رزیش ده كه وێته ته ڵه ی هێماكاری یه وه .

## ٣ ـ هێماكاری له زماندا :

له پێشتره وه له وه دواین كه مروڤ به پێك هاتن ده توانن هێما بۆ هه ر شتێك بیانه وی به كاربهێنن . هه ر له سه ره تای په یدا بوونیانه وه له سه ر ئه م زه وی یه مروڤ له سه ر ئه وه پێك هاتوون كه ده نگه وقیژه ( ئـه وانه ی كـه بـه هـوی سی وقورگه وده م ولووت وئه نداماني تری ئاخاوتنـه وه پێك دێن ) بكـه ن بـه هێـما بۆ رووداوی تر كه له ده ورووبه ریاندا روو ده دات ومێشكیان تۆماری ده كات .

زمان له بنه ره تدا بریتی یه له م رێكه وتنه كۆمه لایه تی یه . بۆ نموونه ، ئه و كه سانه ی به كوردی ده دوێن بێ ئاگایی خۆیان پێك هـاتوون لـه سه ر ئـه وه ی ده نگی / بـه ر / وه ك هێمایـه ك له جیـاتی (( میوه ی ده رخت وگیـاو گول )) بـه كاربێـین . ئه وانـه ی گوێیـان لـه م وشـه یـه ده بێ ولـه كـوردی تێ ده گـه ن واچاوه روان ده كـرێن هـه مـان دیـارده لـه مێشكیـانـدا تـۆمـار بكـه ن (.Hayakawa,24, )

بێ گومان هه روه ك چۆن له هه ندی كومه ڵدا به ر داده نری به هێما بۆ پایه ی كومه لایه تی وله هه ندی كۆمه لی تردا زێر به م ئه ركه هه ڵده سی ، هه روه ها هه ر كۆمه ڵه ده نگێكی جیاواز ( هێمایه كی جیـاواز ) بۆ هـه مان دیـارده به كـاردێنی وئه وه ی له كوردیدا (( به ری )) پی ده وتری له عه ره بی وئنگلیزی وزمانی تردا هێمای تری بۆ دانراوه . ئه گه ر دوو كۆمه ڵ هـه مان هێمـایان بـۆ یه ك دیـارده به كارهێنا ، ئه وا یان ئه و دوو كۆه ـ ڵه خزمن یان یه كێكیان هێماكه ی له ویتره وه خواستووه یان ته نیا رێكه وته كه ئه و دوو هێمایه له یه كتر ده چن .

شایانی باسه كـه مه رج نی یـه هیـج جـۆره په یـوه ندی یـه ك له نێـوان هێماو شته كه ی به رامبه ریـدا هه بێت هـه ... چۆن كـه سێك ده تـوانی جلی مـه له

له به ركات بێ ئه وه ی نیازی مه له كردنی هه بێت یان به درۆوه بلێت (( برسیمه ))
. هه رچه نده ئه م راستی یه زۆر ئاشكرایه ، به لاّم زۆر جار هه ستی پێ ناكه ین تا
هه ولّی ته واو نه ده ین وبه وردی بیر له كێشه كه نه كه ینه وه . وه ك به ره وشت
وشێوه ی بیركردنه وه ماندا ده رده كه وی پێ ئه وه ی هیچ به لگه یه كمان
به ده سته وه بێت زورجار له وباوه ره داین كه په یوه ندی یه ك هه یه له نێوان هێماو
به رامبه ره كه یدا ، ئه گینا بۆ وا به بیرمانا دێ كه زمانی بێگانه (( سه یره )) وپره
له وشه ی (( عه نتیكه )) وهیچ ناوێكیان له جێگه ی خویدا نی یه ، یان بۆ وا
به بیرمانا دێ كه وشه ی (( گا )) له كوردیدا وه ك ئه و ئاژاله ی كه به رامبه ری
ده وه ستی ده بێ ناشیرین وده به ندرێ یان بۆ وشه ی ( هه ستیار ) مان به دڵ نه بێ
هه ر له به ر ئه وه ی (( كه متیار )) مان بیر ده كه وێته وه له كاتێكا كه هێماكه
نه جوانه ی نه ناشیرین ونه په یوه ندی به ئاژه ڵه كه وه هه یه .

## ٤ ـ تایبه تی ودیوه كانی هێمای زمانی :

زمانی مرۆڤ بریتی یه له وپه یره وه ی كه مرۆڤ بۆ له یه كتر گه یشتن به كاری
دێنی . به كارهێنانی په یره وه كه ش به نده به توانای داهێنان ولێكدانه وه و
به كارهێنانی هێماوه كه مرۆڤ له هه موو گیان له به رێكی تر جیا ده كاته وه . هێمای
زمانی بریتی یه له رۆنانێك كه دوو دیویان دوو رووی هه یه ، دیوێكی پێك هاتووه
له ریزه ده نگێك كه به رگوێ ده كه وێ ( ده بیسترێ ) ودیوه كه ی تریشی بریتی یه
له بیرێك كه به رامبه ر ریزه ده نگه كه دێت وله مێشكی مرۆڤدا هه ڵ گیراوه . هه ر
دوو دیوی هێماكه ، ده نگه وبیر ، به هۆی كاری تیكه ڵكردنه وه به یه كتره وه
لكاون . به م پێ یه له كوردیدا ، هێشوه ده نگی ( دوژمن ) ( كه هه ندی جار
رێنووسی كوردی وه ك (( دوشمن )) ده ی نوێنی ) وئه و واتایه ی كه هه یه تی
((كه سێكی ناحه ز یان نادۆست ) یه ك ده گرن وبه هه ردووكیان هێمایه ك پێك دێنن
. ئه م دوو دیوه ی هێما به زۆر شێوه ی جیاواز له زمانه وانیدا ناویان براوه هه ندی
زمانه وان به هێشوه ده نگه كه ده لێن (( فۆرم )) ، (( رووخسار )) یان (( ناو ))
وبه دیوه واتاییه كه ش ده لێن (( بیر )) ، (( ناوه رۆك )) یان (( چه مك )) . به م
جۆره ده توانین بلێین فۆرمی (( دوژمن )) له گه ڵ واتاكه ی دا یه ك ده گرن

له کوردیدا وهێمایه ك دروست ده که ن وه ك له م نه خشه یه ی خواره وه دا ده بینین : ( Malmberg,1963,1 ) .

دوژمن ——————→ دوشمن



که سێکی ناحه ز   نادۆست

له وزمانانه دا که خاوه نی رێنوسن هێما زمانێکه ده توانری به هۆی پیته وه بنوێنری و روخسارێکی وای بدرێتی که له به ر چاوا بێت ( بخوێنرێته وه ) به م جۆره ئه و هێمایه ی سه ره وه ده توانری وه ك هێشوه پیتێك پیشان بدری ( دوشمن ) .
له م دۆخه شدا هیچ له کێشه ی هێماکه نه گۆراوه چونکه خوێنه ر هێشوه پیته که وه ك هێشووه ده نگی لێك ده داته وه و ده ی گێڕێته وه بۆ واتاکه وه . هه ر له به ر ئه مه یه که ده لێین له نووسین دا دوو هه نگاو له راستی دوور ده که وینه وه .
ده بێ ئه و راستیه بزانین که ئه م دوو دیوه ی هێمای زمانی ( فۆرم و واتا ) له یه کتری جیانابنه وه هه رچه نده بۆ مه به ستی لێکولینه وه ناو به ناو له یه کتریان ده ترازێنین . هێمای زمانی خاوه نی ئه م تایبه تی یانه ی خوێه تی : ( Malmberg , 1963 , 2 )
( ١ ) په یوه ندی نێوان روخسارو ناوه رۆك له زۆربه ی زۆری هێما زمانی یه کاندا په یوه ندی یه کی له خۆوه یه . به واتایه کی تر هێشووه ده نگی / دوژمن / خاوه نی هیچ تایبه تیه کی خۆی نی یه که وای لی کردبێ بلێین له باره یان ده گونجێ بۆ ده ربرینی بیرێکی وه ك که سێکی ناحه ز هه روه ها هیچ شتێکیش نی یه واماں لی بکات بلێین ئه م بیره پڕ به پڕی فورمه که یه . هه ر له به ر نه بوونی ئه م په یوه ندی یه که ناتوانین وه لامی پرسیاری وه ك بۆ کورد به پشیله ده ڵێ پشیله وبی نالێ ورج بده ینه وه له وه به ولاوه که بلێین هه ر له مێژه وه باوك و باپیرانمان له سه ر ئه مه رێك که وتوون و ئێمه ش به دوای ئه واندا له سه ر ئه و رێکه وتنه ده رۆین .
( ٢ ) سنوور دانانری بۆ درێژی هێمای زمانی . وشه یه کی کورتی وه ك ( بال ) ده توانین به هێمایه ك دابنێین ، هه روه ك ده توانین رسته یه کی درێژ یان ته نانه ت

پارچه یه ك ئاخاوتنیش هه مووی به تاکه هێمایه ك دابنێین . هه روه ها ده شتوانین بلێین رسته یان پارچه یه ك ئاخاوتن بریتی یه له لێکدانی ده یان و سه دان هێمای زمانی جیاجیا . بۆ نموونه رسته یه کی کوردی وه ك که ره که که پره که ی روخاند ده توانری به تاکه هێمایه ك دابنرێت . له هه مان کاتیشدا ده توانین بلێین رسته که له چه ند هێمایه ك پێك هاتووه وه ك ( که ره که ) ، ( که پره که ) و ( روخاند ) .
بێ گومان ئه م هێمایانه له هه ر زمانێکدا به شێوه یه کی تایبه تی به ره و دوادێن ( بۆ نموونه ، له کوردیدا « که ره که + که » ده بێت به لاّم به پێچه وانه وه « که + که ر » رێگای نادری ) . شایانی تێبینی کردنه که هه ریه کێك له م هێمایانه ئه ندامی کۆمه ڵێ هێمای ترن له زمانه که دا و ته نیا ئه ندامانی کۆمه ڵه که ده توانن جێگه ی بگرنه وه له رسته که دا . بۆ نموونه ده توانین له جێگه ی هێمای ( که ره که ) ، منالّه که ، شوانه که ، پیاوه که ، . . . . . هتد به کاربێنین ، به لاّم ناتوانین ئه ندامی کۆمه لێکی تر ( وه ك : گه وره ، زل ، بچووك ، بان . . . هتد ) له جێگه یان به کاربێنین . ( Malmberg , 1963 , 3 ) .
( ٣ ) هێمای زمانی به پێ ی کات رێز ده بن ، به واتای ئه وه ی که هێماکان به ره و دوای یه کتر دێن له رێچکه ی گوتن داو به شێك له و به هایه ی که هێماکه هه یه تی له وه دایه که له گه ل هێمای تردا به ره و دوا دێت ( په یوه ندی ئاقوولی ) .
( ٤ ) هه موو ئه و هێمایانه ی که له زمانێکدا به کاردێن به یه که وه په یوه وێك درووست ده که ن و به های هه ر هێمایه ك وه رگرین ده بینین که له په یوه ندی نێوان هێماکانی په یره وه که وه هاتووه و له ئه نجامی وه ستانیانه به رامبه ر یه کتری (په یوه ندی ئاسۆیی ) .

## ٣ . هێیا له رووی تاریك و روونیه وه

وه ك له پێشتره وه بۆمان ده رکه وت ئه و هێمایانه ی که په یره وی زمان پێك دێنن هه موویان له و بابه ته ن که پێویستیان به په سه ندکردنی کۆمه لّه . یه کێك له بیره هه ره گرنگه کانی سوسیر ئه وه یه که زمانی مرۆڤ په یره وێکی هێمایی تاریك و له خۆوه یه .
کێشه ی له خۆوه یی هه ر زۆر له مێژه وه ( هه ر له کاتی ئه رستۆوه ) بۆته‌هه

مشت و مرێکی زۆرو ئه وانه ی باوه ڕیان به وه هه یه که په یوه ندی یه ك له نێوان هێماو شتدا هه یه ، ووشه سروشتیه کان ده هێننه وه به به ڵگه به باوه ڕی ئه مانه هه موو هێماکانی زمان له بنه ڕه تدا وه کو پشه و خته و بوڵه و قره ... هتد له لاسای کردنه وه ی ده نگه سروشتیه کانه وه هاتوون . بێ گومان په سه ندکه رانی ئه م بیره لـه وه ده چی بیریـان له وه نـه کردبێتـه وه که تـه نـانـه ت ئـه م وشـه سروشتیانه ش ( که ژماره یان زۆر که مه له زماندا ) پێویستیان به بریاری کۆمه ڵه و ته نانه ت فۆرمه کانیشیان له زمانێکه وه بۆ یه کێکی تر جیاوازه ( سه گی کوردی ده حه پێنی به لام سه گی ئنگلیزی باو - واویتی ) . جگه لـه مه ش ئـه م وشانـه له زمانی تردا به ئاسانی ناناسرێنه وه . ئه گه ر په یوه ندی هه بووایه له نێوان فۆرم و واتای ئه م وشانه دا ، ده بـوایه لـه هه مـوو زمانـه کانی جیهـاندا یـه ك فۆرمیـان هه بووایه و به ئاسانی له وشه کانی تری زمانێك جیا بکرانایه وه و بناسرانایه وه .

تاریك و روونی هێما په یوه ندی نی یه به بوونی یان نه بوونی په یوه ندی له نێوان فۆرم و واتا یان روخسارو ناوه رۆکی هێماکه دا ، به ڵکو به نـده به پـه یوه نـدی هێماکانی زمانێك له ناو خۆیاندا . روونی هێما به چه ند رێگایه ك دێته کایه وه :-

۱- به هۆی دارشتنه وه به زیادکردنی گیره ك ( پاشگر ، پێش گر یان ناوگر ) بۆ نموونه ، وشه ی نه رم له بنه ره تدا تاریکه ، به لام له نه رمایی دا واتاکه ی روونتره به هۆی پاشکر ( - ئایی )وه که له ده یان وشه ی تردا ده بینری .

۲ - به هۆی لێکدانه وه ( به خستنه پاڵ یه کتری دوو وشه یان زیاتر ) . بۆ نموونه وشه ی (( ده ست )) و (( کێشان )) واتاکانیان تاریکه - به لام له وشه ی لێکدراوی (( ده ست کێش )) دا واتاکه روونترة

۳ - به هۆی تێکه لکردنه وه : بۆ نموونه ، واتای (( زانین )) و (( کۆکردنه وه )) تاریکن به لام له (( زانکۆ )) دا که بریتی یه له تێکـه ڵکردن و کـوتانـدنی چه نـد ده نگێك ، واتاکه به (( رون )) داده نری .

تاریك و روونی له هێمای هه موو زمانێکدا هه یه ، به لام گـرنگی دیارده کـه له زمانێکه وه بۆ زمانێکی تر ده گوری وته‌نانه ت له چوارچێوه ی یه ك زمـانیشدا له وشه یه که وه بۆ وشه یه کی تر ده گۆری . بۆ نموونه ، وشه ی (( دڵ خۆش )) و (( دڵپاك )) و (( رووخۆش )) روونن ، هه روه ها (( بخۆ )) و (( برۆ )) ش به هۆی

(( خواردن )) و ((ئـزويشتن )) ه وه واتاكانيان روونه ، به لام هيچ كه ره سه يه ك
نى يه واتاى (( وه ره )) روون كاته وه .

به پىَ ى گرنگى دان به تاريك و روونى هيَما زمانه كانى جيهان ده بن بـه دوو به شه وه : ( ١ ) ئه و زمانانه ى كه هيَماكانيان به زوَرى تاريكن وه ك فه ره نسى ( ٢ ) ئه و زمانانه ى كه زوَربه ى هيَماكانيان رووتن وه ك ئه لمانى . كوردى لـه نيَوان هه ردوو كومه لَه كـه دا ده وه ستى چونكـه وشه ى تـاريكى زوَره ، هه رچـه نده له داتاشينى وشه ى نوى دا ، وشه ى روون په سه ند ده كات .

له زماندا ده بىَ ديارده ى تاريكى و روونيش بكه ويَته ژيَر ده سه لاتى بريارى كوَمه لَه وه ، چونكه بوونى پـه يره ويَكى هيَمـايى ته واو روون زمـانه كـه بىَ ييَز ده كات و تواناى گوَرانكارى و گونجاندنى لىَ ده برىَ . روونى هيَما ده بىَ هه ر روَلى رابـه ريَك ببينى و تـه نيا يـاريده ى خـويَندكـاران بدات لـه له بـه ركردنى واتـاى هيَماكاريدا . بىَ گومان روونى هيَما هه رگيز پشتى ته واوى پىَ نابه سترىَ و ده بىَ زوَر به ورياييه وه له گه لَيدا بجولَيينه وه تاوه كو به هه لَه ى گه وره دا نه مان بات .
بوَ نموونه ، زيادكردنى پاشگـرى ( ـه كه ) بـوَ هه مـوو ناويَـك له كـورديدا وه ك ئامرازيَكى ناسين ، نابىَ به هه لَه ى واماناا بيات كه وابزانين له وشه يه كى وه ك (( كوَلَّه كه )) (( كوولـه كه )) و (( جووله كه )) دا دوو پات بوونه وه .

## نيشانه و هيَما :

نيشانه و هيَما له و زاراوانه ن كه هه ر زمانه وانه به جوَريَكى جياواز به كاريان ديَنى . نيشانه ئاسايى واتايه كى فراوانترى هه يه و هه موو ئه و شتانه ده گريَته وه كه له برى شتى تر داده نريَن و سه رنج بوَ شتيَك راده كيَشن كه خوَيان نين . له به ر ئه مه ، وشه به نيشانه ده ژميَرى و زمانيش به په يره ويَكى نيشانه يى . ئه گـه ر نيشانه به م واتا فراوانه به كارهات ، ئه وا ده كريَت به چه ند جوريَكه وه وه ك (( هيَما )) و به لَگه و . . . هتد . ( Spence , 1976 , 510 )
هيَما له لاى زوَربه ى زمانه وانه كان بريتى يه له و نيشانـانه كـه مروَڤ بـوَ له يه كترى گه يشتن يان وه ك چه كيَكى بيركردنـه وه به كـاريان ديَنى . بـه لاى

هه موو ئه و زمانه وانانه ی که نیشانه و هێما جیاده کـه نه وه لـه یه کتـری هه مـوو هێمایه نیشانه یه ، به لاّم هه موو نیشانه یه ك هێما نیه و ته نیا ئه و نیشانانه هێمان که بۆ له یه کتر گه یشتن یان تێ گه یاندن به کاردێن و ره وشت و داب و نه ریتی کۆمه لاّیه تی چه سپاندوونی یان بریاری کۆمه ڵیان له سه ره . به واته یه کی تر هێما به و نیشانانه ده وترێ که مۆری کۆمه ڵیان لێ دراوه و کۆمه ل په سه ندی کردوون و ئه ندامانی کۆمه ڵیش بۆ له یه کتر گه یشتن به کاریان دێنن ، بۆ نموونه ، له وانه یه به پێ ی شاره زایی و زانینی پیشووترمان (( سووربوونه وه )) به (( شه رم )) و ((دووکـه ڵ )) ((به ئـاگرو )) (( تـا )) به نـه خۆشیـه وه ببه ستێنـه وه و بڵێیـن ((سوربوونه وه )) نیشانه ی (( شه رمه )) و (( دووکه ڵ )) نیشانه ی (( ئاگر )) و (( تا)) نیشانه ی (( نه خۆشی یه )) به لاّم ناتوانین بڵێین (( دووکه ڵ )) هێـ ای (( ئاگره)) یان (( سوربوونه وه )) هێمای (( شه رم )) ه یان (( تا )) هێمای (( نه خۆشیه )) ، چونکه ئه م نیشانانه مۆری کۆمه ڵیان پێوه نه نراوه و بوون و نه بوونیان په یوه ندی به بریارو په سه ندکردنی کۆمه له وه نی یه ، به ڵکو په یوه ندییه کی (( سروشتی )) (( دوکه ڵ )) و (( ئاگر )) یان (( سوربونه وه )) و (( شه رم )) یان (( تا )) و ((نه خۆشی )) به یه کتره گه یه نی . به پێچه وانه ی ئه مه شه وه ، په یوه ندی نێوان کۆمه ڵه ده نگێکی وه ك / ئاگـر / له گـه ڵ ئه و دیـارده یه ی لـه کوردیـدا بۆی ده گه رێته وه په یوه ندییه که له داب و نه ریت و خووره وشتی کورده وه هه ڵ قولاّوه و مۆری کوردی پێوه یه و کۆمه ڵگای کوردی په سه ندی کردووه ، له به ر ئه وه ده توانین بڵێین فۆرمی ( ئاگر ) هێمایه بۆ (( ئه و گروگه رمیه ی که ده توانی شت بسووتێنی )) .

هه ر چه نده زمان گرنگترین و ئاڵوزتـرین و وردترین پـه یره وه کـه که ڵـك له هێماکاری وه رده گرێ ، ده یـان په یـره وی نازمـانی تریش هـه ن که کـه ڵك له هه مان بنه ما وه رده گرن و له سه ری ده رۆن به رێوه ، به واتای ئه وه ی شتێك له بریتی شتێکی تر به کاردێنن به پێ ی بریاری کۆمه ڵ . بلاوترین چه شنی ئه م په یره وانه گلۆپی په رینه وه و نیشانه کانی سه ر رێگاو بزاوتنی ده ست و ده م و لێوو برۆیه .

هه ندی شتی تریش وه ك (( وێنه )) و (( له وحه )) و (( نه خشه )) و (( ده نگ تۆمارکردن )) زۆر جار وه ك نیشانه سه یر ده کرێن چونکه شتی تر ده نوێنن نه ك

خۆیان ، ئاشکرایە کە ئەم نیشانانە نە دە چنە وە سە ر ئە و نیشانانـە ی کە پێیـان دە وتری ، سروشتی و (( وە ك )) هە ور )) و (( باران )) ) نە لە و نیشانانە ش کە بۆ لە یە کتر گە یشتن یان (( تێ گە یـاندن )) بـە کاردێن لـە بە ر ئـە وە ی جۆرێـك لە لێکچوون لە نێوان (( وێنە )) و (( شتە کە ی )) بە رامبە ریدا هە یە ، بەم جۆرە نیشانانە دە وتری (( نیشانە ی وێنە یی )) . ئاشکرایە کـە هە مـوو نیشانـە یە کی وێنە یی ئە رك نابینن . بۆ نموونە (( وێنە )) یان (( لە وحە )) ئە گە ر جگە لە (( واتـا )) بنە رە تیە کـە واتاو بیـری تریش دە ربـرێ ، واتاو بیـرە کە پـە یوە نـدی بە بریاری کۆمە ڵگاوە یە ، بە ڵکو واتاو بیـرە کە لـە ئە نجـامی رێکە وتنی چـە ند هـونە رمـە ندێکـە وە دێ و ئە وان دە تـوانن لێکی بدە نـە وە ، بە پێچـە وانـە ی ئە مە شە وە ، نیشانە یە کی سە ر رێگا ئـە گە ر لـە رواڵەتیشدا وێنـە یی بێت ، ( پە یوە ندی لێکچوون لە نێوان نیشانە و واتاکانیاندا هە بێت ) بە کارهێنان و کە ڵك لێ وە رگرتن بە ندە بە بریاری خە ڵکە وە بە گشتی و بە مە بە ستی تێ گـە یانـدن و لە یە کتر گە یشتن دانراوە . بە پێ ی پۆلێنە کە ی سە رە وە ، نیشانە کانی سە ر رێگا ، لە بە ر ئە مە ، دە بێ بە هێمایە کی وێنە یی دابنێن ، نە ك نیشانە یە کی وێنە یی . بە مە (( لە وحە )) و (( وێنە )) و (( نە خشە )) ( کە نیشانە ی وێنە یین لە (( گلۆپی پە رینە وە )) و نیشانە کانی رێگا ( کە هێمای وێنە یین )) جیادە کرێنە وە بە پێ ی ئـە وە ی ئایـا لێك دانـە وە و بە کـارهێنانیـان پێویستی بـە بریـاری کۆمـە ڵە یـان لێکچوونە کە لە خۆیدا بە سە بۆ لێکدانە وە یان .

هە ر چە ندە جیاکـردنە وە ی هێمـاو نیشانـە ورە و رێکی زۆری لە دوایـە ، لە زمانە وانیدا جیاکردنە وە کە هێندە گرنـگ نی یە ، بـە ڵکو پێـویستیش نی یە ، چونکە زمانە وانی خە ریکی لێکدانـە وە ی لە یـە کتر گـە یشتنە ، لـە بە ر ئـە مە زاراوە ی نیشانە بە کاربێنێت یان هێما ، ئاشکرایە کە مە بە ستە کە هە ر هێمایە ، یان ئە و نیشانانە ی کە مۆرکی کۆمە ڵی پێوە یە .

هە ندی زمانە وان بە جیاکردنە وە ی نیشـانە و هێمـاشە وە نـاوە ستن بە ڵکـو دە یانە وی نیشانە و هێـما لە بـە ڵگە ( ئیشـارە Signal ) جیابکـە نە وە بـە لای ئە مانە وە بە ڵگە بریتی یە لە و نیشانە یە ی کە هە ستی پێ دە ربرێت وە ك بانگ و هاوار ( ئاخ و ئۆف ئە یە رۆ . . . هتد ) بزاوتنی دە م و لێو و چاو برۆ ، درێژی

ده نگه و هێز و ئاواز . . . . . . ئه مانه له وه دا له نیشانه و هێما جیاده بنه وه که ( ۱ ) شته که ی به رامبه ری ده وه ستن ( مه‌دلوله کانیـان ) دیاری کـراو نی یه و (۲) هه موویان بۆ هه ست ده ربرین نه ك زانیاری گه یاندن به کاردێن .

( Spence , 511 )

ئاشکرایـه که نیشـانه لـه په یـره وێکدا کـارده که ن ، بـه لاّم په یـره وه کان له ئاڵوزیدا وه ك یه ك ناوه ستن بۆ نموونه ، په یره وی بزاوتن ( لێو هه ڵ قورتان ) ده م خوارکردنه وه ، برۆ هه ڵ ته کـاندن . . . . هتـد ) ته سکـه و نیشانـه کانی لـه یه کـتر ده چن و له نـاو خۆیـانـدا رێکن . پـه یـره وی گلۆپی پـه رینـه وه ، به پێچه وانه ی په یره وی بزاوتنه وه ، په یره وێکی ته سککترو ( ژماره نیشانه کانی که متره ) داخراوتره ( نیشانه ی بۆ زیادناکری ) ، له به ر ئه مه درشت و ساده یه . زمان ، به پێچه وانه ی هه ردووکیانه وه په یره وێکی ته واو ئاڵۆزه و ورده چونکه ژماره ی نیشانه کانی ( هێماکانی ) زۆرن و هه میشه کراوه شن ( ده توانن زیادبکرێن). له به ر ئه مه یه که له هه موو ئاستێکی زماندا ( ده نگسـازی ووشه سـازی و رسته سازی ) هه ست به وه ده کری که دانه کان ته واو چوون به ناو یه کتریدا و ته واو تێکچۆراون و شلی و شێواوی نی یه .

نیشانه له ناو خۆیاندا دیسانه وه به پێ ی راده ی بریاری کۆمه ڵ جیاده کرینه وه . بۆ نموونه ، ئه و هێمایانه ی له بیرکاریدا به کاردێن ( وه ك + ، - ) ۲ ، د . . . . هتـد ) پێویستی تـه واویان بـه په سـه نـدکـردن هـه یـه لـه لایـه ن کـۆمـه ڵـه وه به پێچه وانه ی ئه مانه شه وه ، نیشانه کانی سـه ر رێگه تێکـه ڵن ، هه نـدێکیان پێویستی به کۆمه ڵ هه یه و هه ندێکی تریان بـربـاریـان ناوی چـونکه وێنـه ین . دیسانه‌وه گلوپی په رینه وه ش هه ندی ره نگی هه یه ( سه وزو زه رد ) که ده بێ کۆمه ڵ لـه سه ریـان پێك بێ . هـه رچی ره نگه سـووره که یـه ده توانـین بلێین تاراده یه ك پێویستی به و پێك هاتنه ی خه ڵکی نابێ ، چونکه وێنه یی یه ( له خوێن ده چێ و خوێن به ربوونمان بیر ده خاته وه ) له هه ڵکه وتدا دێته کایه وه .

## هێماکاری و زمانه وانــی :

زۆربه ی زمانه وانه کان زمان به په یره وێکی تایبه تی هێمای زمانی داده نێن ، به واتای ئـه وه ی که زمـان بریتی یـه له کـۆمه ڵـه هێمـایـه کی زمـانی تێکچڕژاو که له چوارچێوه ی په یره وێکی وردا کارده که ن . ئاسته سه ره کیه کانی زمان ( ئاستی وشه و رسته و ده نگ ) هه ربۆ که یان خه ریکی لێکدانـه وه ی رووبه کی هێمای زمانی یـه : ده نگسازی خـه ریکی لێکدانـه وه ی فۆرم یـان روخساره ، واتاسازی خـۆی بۆ لێکـدانه وه ی دیـووی واتای هێمـاکان تـه رخان ده کـات و رێزمانیش بۆ هێما به گشتی وه ك ئه م وێنه یه بۆمان روون ده کاته وه .



## به شی دووه م

# ڕۆنان و پێره و له زمانـــدا

هه ندی جار له زانستی زماندا ڕۆنان و پێره و به هه مان واتا به کاردێن . هه ندی جاریش هه ریه که یان واتایه کی جیاوازی ده درێتی : ڕۆنـان بۆ لێکـۆلینه وه ی هه ڵکه وتی که ره سه ی ئالۆز ( وه ك وشه یان ڕستـه ) و پیشانـدانی په یـوه ندی دراوسێتی پـارچـه کـانی و بـۆ لێکـدانـه وه ی پـه یـوه نـدی ئـه و پـارچـانــه ی که له چوارچێوه یه کدا له بریتی یه کتری به کاردێن ( Hudson , 1976 , 279 . ) .

هه موو زمانه وانه کان ڕێکن لـه سه ر ئـه وه ی که زمـان پێره وه ، بـه واتای ئه وه ی که زمان کۆمه ڵه که ره سه یه کی ڕێزکراو نیه . ئه گه ر وابوایه لێکۆلینه وه له زمان بریتی ده بو له ڕێزکردنی هه موو ئه و وونانه ی ( وشه و ڕسته و فه قه رانه ی) که پێی ی ده ربرێت و فێربونی زمانیش بریتی ده بو له فێربونی هه موو ئه و وتانه ، هه روه ك قوتابی یه ك لیسته ی وشه ی زمانی بیگانه له به رده کات . زۆر به ئاسانی بۆمان ده سه لمێت که زمان له هه ڵکه وتدا به م جۆره نیه ، ئه گه ر وابوای ، چۆن هه مومان ده مانتـوانی ڕسته ی واده رکـه ین و له ڕستـه ی وابگه ین کـه هه رگیـز له مه وبه ر ده رمان نه کردبێت و نه مان بیستبێت ؟ سنوریش نیه بۆ ژماره ی ئه و ڕستانه ی که ده ری ده که ین چونکه هه رگیز ناتونین درێژترین ڕسته ی زمانێك دیاری بکه ین .

که له ژماره یه کی زۆر ڕسته ده کۆڵینـه وه ده بینین نهێنی کـاره که لـه وه دایه که له نێوان ڕسته یه ك و ڕسته یه کی تردا جۆره (( لێکچونێکی ناته واو هه یه )) ئه گه ر دوو ڕسته جیاوازیش بن له یه کتری ، هێشتا ته واو جیاوازنین له هه موو ڕوویه که وه و له وانه یه له هه ندی ڕوودا ناوکۆیان هه بێت ئـه م ناوکـۆیانـه ش له ڕسته ی تریشدا دووپات ده بنه وه . ئه م ناوکۆیانه ده بنه هۆی ئه و (( ڕێکچوونه ناته واوه )) ی که له سه ره وه باسمان کرد . بێ گومان ژماره ی ئه م نـاوکۆییـانه دیاری کراون ، به ڵام ژماره ی ئه و ڕستانه ی که تێدا ده بینرێنـه وه بێ سنوره .

ئه رکی زمانه وان ئه وه یه که ئه م ناوکۆییانـه بدۆزێتـه وه و په یـوه ندی نێـوانیان ده ربخات ، هه ر ئه م ناوکۆییانه و په یوه ندییه کانی نێوانیانه که ڕۆنان یان نیزام ده ده ن به زمان .

جیاوازی نێوان ڕۆنان یان پێره وی ژێره وه وه له گه ل ده رکه وتنی له گوتن دا به زۆر شێوه ی په نچه ی بۆ ڕاکێشراوه . به لای ( سوسیر ) ه وه ڕۆنانی ژێره وه (( زمانه )) وده ره وه ی (( تێکسته )). هه رچی جومسکیه (( ڕۆنانی ناوه وه )) به (( چالاکی )) ودیوی ده ره وه ی به (( به جێ هێنان )) داده نێ . ( Hudson , 1976 , 279 ) .

به م جۆره لێکۆلینه وه له زمان دیاری کردنی ڕۆنانی ژێره وه وتـه کانی ئـه و زمانه یه .

## ئاسته کانی زمـــان :

زمـان ، که لـه خۆیـدا ئیشاره ت دانـه ، پێك هـاتووه لـه چه نـد ئاستێکی تێکچرژاوو که هـه نـدێکیـان سـه ره کیـن و ئـه وانیـتر لاوه کی . سێ ئـاستـه سه ره کێکان ئه مانه ن : ( Hall , 31 )

١ ) ئاستی ڕسته سازی .

٢ ) ئاستی وشه سازی .

٣ ) ئاستی ده نگه سازی ( فۆنه تیك ) .

به م سێ ئاسته ده وترێت سه ره کی چونکه ڕاسته خۆ په یوه ندیان له گه ل (( مه به ست )) دا هه یه نه ك له گه ل چوارچێوه ی قسه کردن ( سیاق ) دوو ئاسته لاوه کیه که ش ئه مانه ن :

١ ) ئاستی ده نگه سازی ( فۆنه نیك ) : ئه رکی ئه م نیزامه گۆڕینه وه ی مۆرفیم ی وشه کانه بۆ ده نگه به هۆی جوڵانه وه ی ئه ندامانی ئاخاوتنه وه *( ٢ ) .

ئه م ئاسته لاوه کیانه به وه له سه ره کێکان جیاده کرێته وه که کار له دووشت ده که ن ١ ـ چوارچێوه ی قسه ( بارو دۆخی ده ورو به ر ) ٢ ـ ئاسته سه ره کێکان . ئاستی واته سازی ، بۆ نموونه ، له لایه که وه

* ( ٢ ) ئاستی واتاسازی : ـ ئه رکی ئه م پیره وه ش به ندکردنی وشه و مۆرفیمه به ده ورو به ری مرۆڤه وه .

راسته وخۆ کاردە کاتە سە ر ئە و جیهانە کۆمە لآیە تی وفیزیکیە ی کە تێیدا دە ژین ولە لایە کی تریشە وە کاردە کاتە سە ر ئاستی رستە سازی زمانە کە .

هە روە ها ئاستی فۆنە تیکی لە لایە کە وە راستە وخۆکاردە کاتە سە ر ئە و شە پۆلە دە نگانە کە قسە ی تێدا پێچراوە تە وە و لە لایە کی تریشە وە کاردە کاتە سە رئاستی فۆنیمێکی زمانە کە .

بە گشتی زمانە وان زیاتر گۆی دە داتە سێ ئاستە سە رکێکە بایە خێکی ئە وتۆبە وانیتر نادات . هە ندی زمانە وان پێناسە ی زمان ئە وە ندە تە سك دە کە نە وە کە تە نیا ئە م سێ ئاستە سە رە کیە بگرێتە وە . بە م جۆرە کێشە ی فۆنە تیك ووواتا بۆ زانستە نزیکە کان ( نە ك زمانە وانی ) جێ دە هێڵن . ئاشکرایە کە ئاستە لاوە کێکان گرنگیان لە سە رە کێکان کە مترنیە وشایانی لێکۆڵینە وە ن هە رچە ندە زۆر گرانترخۆ دە دە ن بە دە ستە وە .

هە مو زمانە وانە کان لە سە ر ئاستە کانی زمان وژمارە یان رێك ناکە ون هە ندێك زمانە وان ئاستی سە رە کی وناسە رە کی جیا ناکە نە وە ورایان وایە کە زمان لە سێ ئاست پێك دێت : ئاستی دە نگە ، ( لە رووی ئە رکە وە ـ فونولوجی ) ئاستی رستە و ئاستی واتا . دیسانە وە زمانە وانە کان لە روویە کی تریشە وە رێك ناکە ون لە لێکۆڵینە وە کانیاندا : ـ ( Hall , 33 )

هە ندێکیان لە سە رە وە ( ئاستی رستە سازی ) بۆ خوارە وە ( فونولوجی ) دە رون . هە ندێکی تریان بە پێچە وانە وە لە خوارە وە بۆ سە رە وە . لە بە ر ئە وە ی ئاستە کان تە واو چوون بە ناو یە کتریدا وتێکچرژاون وتە نیا کاتێك تێیان دە گە ین کە بە یە کە وە بن گرنگە نیە لە لێکۆڵینە وە دا لە کوێوە دە ست پێ دە کە ین وبە رە و گوێ دە رۆین .

هە ر ئاستێك لە م سێیانە ی سە رە وە بە سێ شێوە دە نوێنرێت : ـ

یە کە م : بە بۆنە ی ( دانە یە ك ) یان زیاتر لە کە رە سە ی ئاستە کە .

دووە م : بە و تێکە ڵی ولێکچوونە ی دانە کان پیشانی دە دە ن کاتێك قسە کە ر لە یە کیان دە دات ، یان کە کۆدە بنە وە وزنجیرە یە ك دروست دە کە ن ( لە کاتی وادا ، بێ گومان ، جاری وا هە یە مە رج دێتە کایە وە کامیان پێش کە ون ، کامیان لە دواوە بن ، کام دانە لە گە ڵ ئە وە ی تردا ناروات . . . . هتد ) .

سێیه م : به و په یوه ندییه‌ی وانه یه ك له نێو خۆیاندا ده یهێننه کایه وه ـ به وه ی چۆن دانه که خۆی ده کات به ناو ڕۆنانه ڕێزمانیه که ی خۆیدا . ( Bolinger , 1972 , 54 )

له ئاستی ده نگدا ، بۆ نموونه ، یه که م جار دانه ده نگیه کان / ق ، د ، ت هتد / دێنه به رچاو به دوای ئه مانه دا ، زنجیره ده نگه دێت ( برگه یان له ته برگه ) که تێیاندا دانه ده نگیه کان ده چنه سه ریه ك له یاسایه کی تایبه تی بۆ نموونه ، یه کێك له تایبه تیه کانی ده نگی / ر / له کوردیدا ئه وه یه که ناڵکێت به ده نگی تره وه له سه ره تای برگه دا . له دوایشدا ئه و په یوه ندییانه دێن که دانه کان له ناو خۆیاندا له یه کتری جیاده که نه وه .

له ئاستی وشه دا ، یه که م جار مۆرفیم دی له پاشدا وشه و په یوه ندی گونجان که ڕێگامان ده دات بڵێین ـ ماره که به مناڵه که وه ی دا ( نه ك مناڵه که به ماره که یه وه دا ). به دوای ئه مانه شدا ( کێڵگه ی واتای ) دێت تێیدا وشه کان به پێی واتای پۆل پۆل ده کرێن وه ك ( ڕۆژه کانی هه فته ) ناوی شوێن زاراوه ی زانیاری ) .... هتد .

له ئاستی ڕسته شدا ، دیسانه وه وشه دێته وه به رچاو به لام لێره دا نوێنه ری به شه کانی ئاخاوتنه ( ناو ، جێ ناو ، ئاوه ڵناو .... هتد ) وپه یوه ندیان که م وزۆر به واتاوه نامێنێت . به دوای ئه مانه دا ، زنجیره ی ڕسته یی دێته کایه وه که تیایاندا ئه م به شانه ی ئاخاوتن ( شوێنی ) تایبه تی وه رده گرن ( ناو له شوێنی بکه ر له گه ڵ ناو له شوێنی به رکار ڕسته یه کی هه واڵده رمان ده داتی وه ك (مه یمونه که مۆزه که ی خوارد ) . به دوای زنجیره ی ڕسته یدا ، کۆری ڕسته یی دێن که تێیدا که ره سه ی ڕسته یی به پێی ئه رك پۆل ده کرێت . بۆ نموونه ( ئیبتوا ) ابه گه ڵ . به خێرایی ده چنه یه ك پۆل ( ئاوه ڵکاری ساده وئاوه ڵکاری لێکدراو ) . ( Bolinger , 55 )

## پله ی ئاسته کان

________________ :

زۆربه ی زمانه وانه کان له سه ر ئه وه ڕێك ده که ون که ئاسته کانی زمان ودانه کانی ده بێت به پێی پله یان ڕێز بکرێن . چه مکی ڕیزکردنی دانه

ڕێزمانیە کان بە پێ ی پلە ی یان زۆر کۆنە ولە کارە کە ی بلووم فیلدا پە نجە ی بۆ ڕاکێشراوە وە ك بە شی کردنە وە ی کە ڕە سە ڕاست وخۆکانی ڕستە دا دە ردە کە وی . ئاسایی وە ك لە زۆربە ی کارە کاندا دە ردە کە وێت لە م جۆرە شی کردنە وە یە دا ، یە کە م جار دانە گە ورە کان جیا دە کرێتە وە ئنجا بە رە بە ر ئـە مانـە ش شی دە کرێتە وە بۆ کە رتی بچوکتر تا زمانە وانە ك دە گاتە ئە و کە رتانە ی کە لە مە زیاتر لە ت ناکرێن . لێرە دا بلووم فیلد ئە و چە مکە مان دە داتی کە دانە ی گە ورە لە دانە ی بچوکتر پێك دێت .

زۆر زمانە وان باوە ریان وایە کە ڕێزمان و فونولوجی لە ڕاستیدا فـونە تیکـە وە رگیراون :




دە توانین بە م جۆرە بلێین کە ڕاستی ڕێزمانی یان فونـولوجی بـە شێوە یـە کی فۆنە تیکی دە نوێنرێت . لە هە ر ئاستێکدا چە ند دانە یە ك دە ناسرێتە وە پلە یان دە دریتی لە ڕێزکردندا . هە ردانە یە ك ( جگە لە نزمترین دانە ) لە دانە یە ك یان زیاتر لە و دانانە پێك دێت کە ڕاستە وخۆ لە پایە دا لـە خوی نـزمترە . ژمـارە ی دانە کان لە وانە یە لە زمانێکی تر بگۆرێت بە لام بە شێوە یە کی گشتی ٥ ـ ٦ دانە ی ڕێزمانی لە زۆر لێکۆلینە وە دا دانیان پێدانراوە . کە لە بچوکە وە بۆ گە ورە بە م پێیە ڕیز دە کرێن :

مۆرفیم ـ وشە ـ فرێز ـ لا ڕستە ـ ڕستە .

بە هە مان شێوە لە ئاستی فۆنۆلۆجیشدا چە ند دانە یك دە ناسرێتە وە کە بە پی ی پلە لە فۆنیمە وە ( نزمترین پلە ) سە ردە کە وێت بۆ ڕستە ی ئاواز ( بە رزترین پلە ) .

فۆنیم ـ برگە ـ ڕستە ی ئاواز .

لە بە ر ئە وە ی ڕێزمان وفونولوجی دوو جۆر تە جزیدی جیاوازن ناتوانین بلێین مۆرفیم لە فونیم ( پێك هاتووە ) زاراوە ی پێك هاتن تە نیا کاتێك بە کاردێت کە لە

په یوه ندی ناو دانه کانی یه کێك له ئاسته کانی بدوێن . کاتێك له په یوه ندی نێوانه
دانه ی ئاستێك له گه ڵ دانه ی ئاستێکی تردا دواین ، بۆ نموونه ، له په یوه ندی
نێوان فونیم و ( ئاستی فۆنۆلۆجی ) مورفیم ( ئاستی مۆرفۆلۆجی ) ، ئه وسا زاراوه ی
(نواندن ) به کاردێنین به م جوره ده توانین بڵێین مورفیم به هـۆی چه ند فونیمێکه وه
ده نو ینرێت یان چه ند فونیمیك ده توانین پێکه وه مورفمیك (بنوینین) ه ك پێك بهێنین
به پێچه وانه وه که ده رباره ی په یوه ندی وشه و مۆرفیم بدوێن ده بینین زاراوه ی ( پێك
هاتن ) به کاربهێنین چونکه له باره ی دانه کانی یه ك ئاسته وه ده دوێن . به م جۆره
ده توانین بڵێین وشه له یه ك مورفیم یان زیاتر پێك دێت . ( Hudson , 279 )
ئه و دانانه ی ده که ونه ناوه راسته وه ( وه کو وشه یان برگه ) به دوو جۆر ده توانین
لێیان بدوێن ( ١ ) به هۆی ئه و دانه نزمانه ی که دروستیانن ده که ن ( ٢ ) به هۆی
ئه و دانانه ی که له خۆیان به رزترن وئه مان پێکی ده هێنن . به م پێیه ده توانین
بڵێین وشه یان له مورفمیك یان زیاتر پێك دێت ئه و دانانه ن که فریزیك پێك دێنن
هه روه ها ده توانین بڵێین فریز ئه و دانانه ن له وشه پێك هاتوون یان رسته پێك دێنن
. لا رسته ش ئه و دانانه ن که یان له فریز پێك هاتوون یان رسته پێك ده هێنن .
ئاشکرایه که نزمترین دانه ته نیا به یه ك جۆر ده توانین له باره یه وه بدوێین ، چونکه
دانه نیه له خۆی نزمترین پێکی بهێنێت . مۆرفیم ، بۆ نموونه ، له به ر ئـه وه ی
نزمترین دانه ی رێزمانه ، به ته نیا به ودانانه داده نرێت که وته پێك ده هێنێت .
هه روه ها فۆنیم ، که نزمترین دانه ی فۆنۆلۆجیه ، ته نیا به ودانه یه دادده نرێت که
برگه دروست ده کات . به رزترین دانه ش ( رسته و رسته ی ئاواز بۆ نمونه ) ،
دیسان هه ر به یه ك رێگه لێیان ده کۆلرێته وه . ( Bolinger , 54 )
هه ردانه یه ك زۆربه ی کات له ئاستی خۆیدا ئه رکی خۆی به جی دێنێت به لام
هه ندێ جار هه ندی دانه له ئاستی خۆیان دا ده رچن وپـایه ی خـۆیان نـزمترین
ده که نه وه . بۆ نموونه : ـ

من هێنام .

پایه ی رسته ی هه یه ، به لاّم له رسته ی :

ئه مه ئه و کتێبانه یه من هێنام .

بۆته پارچه یه ك له ( کتێبه کان ) وپایه ی نزمتری وه رگرتوه .

ئایا کێشه ی دانه و ئاسته کانی زمان په یوه ندیه کی پته وی به وەرگێرانه وه هه یه؟.
وه رگێران گـه ڕانه بـه ئاستێکی دیـاری کراودا لـه و زمانـه دا که بـابه تـه که ی وه رده گێرینه سه ره که به رامبه ر ئاستێکی دراو بوه ستێت له زمانه سه رچاوه که دا . بۆ نمونه وشه ی لێکدراوی ( گورگه زی ) ی کوردی به رامبه ری ن یه له زۆر زمانی تردا له هه مان ئاستدا ( له ئـاستی وشه سـازیدا ) . لـه به ر ئـه وه ده بێت له ئاستی ڕسته دا به رامبه ری بۆ په یدا بکه ین له وه رگێراندا . وه رگێرانی ڕاست و باوه ڕپێکراو ) ( نموونه یی ) هه وڵی ئه وه ده دات که ئه و دووئـاسته یـان ته واو به رامبه ر یه کترین ( وشه به وشه فریز به فریز وه ربگێرێت ) یان نـزیك بێ لـه یه کتری ( وشه به فریز . . . بۆ نموونه ) ئینجا له به رئه وه ی زۆر جار ئه مه له تواناداا نابێت ، ناچار ده بێن که دان بنێین به و راستیه دا که وه رگیرانی نموونه یی وه ك ژنی نموونه یی که م جار جوان ده رده چێت .

## هه ندی دانه ی زمانه وانی

:

## ١ ـ فۆنیـم

:

هـه رچـه نـده بیـری فـونیم لـه سـه ره تـای سـه ده ی نـوزده وه لـه کـاره زمانه وانی یه کانی ئه وروپاو ئه مریکادا به کارهاتووه . به ڵام له سه ره تای داهێنانیدا زیاتر دیارده یه کی فۆنه تیکی ده گرته وه وبه واتای ( فۆن ) ی ئێستا ده هات نه ك بیرێکی رووت که له ئه نجامی به رامبه ری جیاوازی کردنه وه هاتبێته کایه وه ( د . کریسته ل ١٩ ل ١٧٨ ) بۆ یه که م جار زاراوه ی فۆنیم ئێستا بۆ دابه شته ی له کارێکی زمانه وانی پۆله ندی ( بودوین دی کورتنی ) دا له سه ده ی هه ژده دا ده بینری به ڵام به دوای داهێنانه شدا بیره که تا چه ند سالێـك هه روه ك خـۆی مایـه وه وکه س هه وڵی دیاری کردن وپێناسه کردنی دیارده که ی نه دا بیری فۆنیم دیسانه وه له کاره مێژوویه که ی سوسیـریشدا هـه ستی پێ ده کرێ هـه رچـه نـده زاراوه که نـاوی نه هاتووه . هه روه ها له کاره زمانه وانیه کانی ئه مریکای بیسته کانیشدا ( ١٩٢٠ ) هه وڵی ئه وه دراوه ده نگی گرنگ ونا گرنگ له یه کتری جیا بکرێنه وه ( ئه مه ش

بنه مای رۆنانی فۆنۆلۆجیه ) به لام نه بوونی پێناسه یه کی وردی فونیم بۆته هـۆی نانه وه ی گێژاوێکی گه وره له م کارانه دا ( د . کریستـه ل ١٩٧١ و ل ١٧٩ ) لـه کۆتـایی بیسته کـاندا بـۆ یه کـه م جار پێنـاسه یـه کی وردی فۆنیم لـه لایه ن دامه زرێنه رانی قوتابخانه ی پراگه وه ئه رایه روو ، به تایبه تی پێناسه که ی زمانه وانی رووسی ( ترۆبیتسکۆی ) وئه و یاسایانه ی بۆ دیاری کردن وناسینه وه ی فۆنیم داینان کارێکی ته واوی کرده سه ر هـه موو کاره کانی دوای خـۆی له هـه مان کـاتیشدا زمانه وانه وانی بریتانی دانیال جنز یش ئه وه ی ته واو ئاگه داری کاره زمانه وانیه کان بێت پێناسه یه کی جیاوازی بۆ دیارده که داناکه سه ره تای قۆناغ روانینێکی نوێ بوو .

هه ست کردن به بیری فۆنیم گرنگی دیارده که کارێکی گران نی یه و زمانه وانی ناوێ . هه موو که سێك به سه لیقه ده تـوانی هه ست بکـات کام ده نـگ له و ده نگانه ی که له زمانه که یدا هه یه گرنگه وکامیان گرنگ نی یه ، یان کـام له و ده نگانه له یه کـتر ده چن وکامیـان جیاوازن . بـۆ نموونـه ، هه مـوو کوردی یـه به سه لیقه هه ست به و ده کات که ده نگی / ب / له ده نگی / پ / نزیکه و له ده نگی / د / ه وه دوورتر. یان ده نگی / ج / له / چ / ه وه نزیکه به لام له ده نگی / ب / ه وه دووره . به لگه مان بۆ ئه م هه ست پی کردنه ئه وه یه کـه رینووس دانه ره کانی کوردی له پیتی ( ب ) و ( ج ) وه نیشانه یان بۆ نووسینی ده نگی / پ / و / چ / داتاشیوه . هه روه ها له پیتی ( ز ) و ( ف ) نیشانه یان بو ده نگی / ژ / و / ڤ / دروست کردووه . ئه مه ش له خۆیدا به لگه یه که ئه م رینووس تـاشانـه دوورو نزیکی ئـه م ده نگانـه یان لـه یکتـرییـه وه هـه ست پی کـردووه وناسیوه ته وه . دیسانه وه هه موو کوردی هه ست به وه ده کات که وشـه یه کی وه ك ( با ) ز ( پا ) له دوو ده نگ پێك هاتوون وده نگی دووه میان له یه کتریان جیا ده کاته وه ( واتای جیاوازییان ده داتی ) ئاشکرایه که وه ستاندنی ئه م دوو ده نگه ( آ ) و ( ی ) به رامبه ر یه کتری له م شوێنه دا بۆته هۆی دروست کـردنی جیاوازی واتایی له نێوان دوو وشه که دا به شێوه یه کی گشتی ، به م جۆره ده نگانه ده وتری فۆنێم ، به واتای ئه و ده نگانه ی که جیاوازی واتای پێك دێنن یان دوو وشه له رووی واتای له یه کتری جیاده که نـه وه . به راوردێکی ئـه و دوو وشه یـه ی سه ره وه له گه ڵ چـه ند وشـه یه کی تـردا وه ك ( بوو ، بـه ، بۆ ) ئـه و راستیه مـان بۆ

ده رده خات که ده نگی ( آ ، ی ، و ، ه ،ۆ ) فۆنیمن له کوردیدا ، به واتای ئه وه ی جیاوازی واتایی ده هێننه کوردییه وه . هه روه ها به راوردکردنی کۆمه له وشه یه کی وه ك : شه نگ ، زه نگ ، سه نگ ، ژه نگ ، له نگ ، فه نگ ، هه نگ ، ده نگ ، پێنگ ، ره نگ . . . . هتد وامان پیشان ده دات که ده نگی / ش ، ز ، س ، ژ ل ، ت ، د ، ب ، پ ، ر / . . . . . هتد دیسانه وه له کوردیدا فۆنیمن چونکه جیاوازی ده خه نه نێوان وشه ی کوردییه وه . بێ گومان ، ئه و ده نگانه ی له زمانێکدا به فۆنیم داده نرێت مه رج نی یه له زمانی تریشدا هه مان پایه یان هه بێ .
به به راووردکرنی دوو ووشه ی ( په ڵه ) و ( په له ) یان ( برین وبڕین ) تێمان ده گه یه نی که ده نگی / ڵ / و / ل / و / ر / و / ڕ / له کوردیدا فۆنیمن . به لام ئه م ده نگانه له زمانێکی وه ك عه ره بیدا هه رچه نده هه ن وبوونیان هه ستی پێ ده کرێ ، پله ی فۆنیمیان نی یه و به هه ردووکیان ، (به واتای دوو / ر / ه که ودوو / ل ه که ) یه ك فۆنیم پێك دێنن چونکه دوو وشه نی یه له عه ره بیدا له ئه م دوو ده نگه به ته نیا له یه کتری جیایان بکاته وه .
ئه م راستیانه ی سه ره وه ئه وه مان بۆ ده رده خه ن که بیری فۆنیم وه نه بێ شتێکی نوێ بێ له سه ره تای سه ده ی نوزده دا هه ڵی دابێ ، به ڵکو به پێچه وانه وه بیره که هه ر هه موو قسه که ران هه ستیان پێ کردووه وزمانه وانه کانیش بێ ئه وه ی ناوی لێ بنێن وه ك بنه مایه ك له کاره کانیدا به کاریان هێناوه وپه یره ویان کردووه . به لام هه ست کردن به بوونی فۆنیم وناسینه وی شتێکه وجیاکردنه وه وپێناسه کردن ودیاری کردنی شتێکی تر . تائه و کاته ی زمانه وانه کان دیارده ی فۆنیمیان نه ناساندو دیارییان نه کرد ، بیره که ڵکێکی ئه وتوی نه بووو نه ش بوو به به سه رچاوه ی گرێمان . به دوای داهێنانی دانه که دا زمانه وانه کان هه ولی ئه وه یان دا په یره وی بنه ماکه بکه ن نه ك هه ر له ئاستی فۆنۆلۆجیدا ، به ڵکو له ئاسته کانی تری زمانیشدا وده ستیان کرد به گه ران به دوای دانه ی فۆنیم ئاسادا له م ئاستانه داو ئه وه ش بوو به هۆی درووست بوون و هاتنه ناوه وه ی ده یان زاراوه ی وه لا سێمیم تاگمیم وگلوسیم ولێکسیم و مۆرفیم وفونێم و . . . په یدابوونی بو چوونی ( ئیمیکی ) جیاکردنه وه ی دانه له سه ر بنه مای ئه رك ـ له زمانه وانیدا . (کریسته ل ل ۱۷۸۳ )

ده بێ بزانین که بیری فۆنیم خه یالێکی زانیاری یه و له راستیدا فۆنیم بوونێکی مادی نی یه . که گوی بۆ که سێك شل ده که ین ، ئه وه ی دێته گوێمان رێچکه یان شریته ده نگێکی به رده وامی به ره ودایه که ناوبه ناو پشوویه کی تێ ده که وێ .
له م شریته ده نگه که دا به رده وام هه ست به وه ده‌کەین ده نگێك چه ند دان یه ك دووپات ده بنه وه . زاراوی فۆنیم بۆ ئه م ده نگه لیکچووانه‌به‌کاردێ وواش به بیرماندا دی که ئه م ده نگه لیکچووه ( دوو ) پات بووانه هه موویان هه ر یه ك فۆنیمن . به م پێ یه که گوێمان ده بێ له رسته یه کی وه ك پێری په ری پینج جار په رده ی په نجه ره که ی په رواند ، وابه بیرماندا دێ که ئه و ده نگه ی پیتی ( پ ) له نووسینی ئه م رسته‌یه دا ده‌ینوێنێ شه ش جار پات بۆته وه وهه مو جارێکیش هه ر هه مان ده نگه و نه گوراوه . به لاّم ئه گه ر باوه رمان وابێت ، ئه وا هه ڵه یه کی زۆر گه وره ده که ین ، چونکه هه موو وتنه وه یه کی ده نگه که له ده نگه بنچینه که جیاوازه ووتنه وه کانیش ـ دیسانه وه له یه کتری ناچن . به م جۆره هه موو جاری که ده م‌هه ڵده نیێنه وه‌وده نگی ده رده‌که ین ، ئه م ده نگه بێ هاوتایه چونکه جاریکی تر هه مان ده نگ ده‌رناکه ینه وه . چه ندیش هه ول بده‌ین هه ر ده توانین ده نگێك وه ك ئه م ده رکه ین نه ك کت ومت ئه م ده نگه . ئه م هه مه چه شنی یه ش ده گرێته وه بۆ چه ند هۆیه ك که گرنگترینیان ئه مانه خواره وه یه :
١ ـ له ژێر کاری ده نگی ده وروبه ردا ئه نداماني ئاخاوتن له گه ل هه مووتنه وه ی ده نگیکدا له یه ك شوێندا نابن به ڵکو هه رجاره لـه شوێنیکـه وه به ره و شـوێنی ده نگه که ده رده چن و ئه مه ش دبێته هۆی دروست بوونی ده نگی جیاجیا بۆنموونه ، ده نگی / ب / ی وشه ی ( باران ) جیاوازه له ده نگی / ب / له رسته‌یه کی وه ك چی بکـه م ؟ دا چونکـه له یـه که مـدا ده نگه کـه له سـه ره تادایـه به لاّم له دووه مدا که وتوته نێوان بزوینێك ونه بزوینیکه وه . له‌به‌ر ئه مه ده وروبه ره که / ك / و / چ / تایبه تیه کی خۆی که ( کپی ) یه به سه ردا سه پاندووه و وای لی کردووه جۆرێك / ب / بێ که له / پ / ه وه نزیك بێ .
٢ ـ هه ناسه ی قسه که رو چه ندێتی ئه و هه وایه ی که له سییه وه ده ری ده کات وچه ندیتی ئه و وزه یه ی که له ده رهێنانی ده نگێکدا به کاری دێنی له بارو بۆنه وی قسه یه که وه بۆ قسه یه کی تر ده گورێ و ئه مه ش دیسانه وه ده بێته هۆی هه مه چه شنی له ده رهێـنانی ده نگێك ــ بـۆ نموونـه ئه و ده نگـانه ی کـه له تـوره پیدا

ده رده برین جیاوازن له و ده نگانـه ی که لـه باریکی ئـارامدا ده وتـرێن چونکـه وزه یه کی زیاتریان تێدا به کاردی .

٣ ـ تایبه تی ئه کوستیکی ئه و شوێنه ی قسه که ی تێدا ده کـری هه رجـاره ی به جۆرێك ده بێ ، له به ر ئه مه ده نگه که ش هه رجاره ی به چه شنێك ده دری بۆ نموونه ، ئه و ده نگه ی له هۆلێکی گه وره ی چۆل دا ده درێ له و ده نگه ناچی که له ژوورێکی پر له قیژه و هاواردا دروست بی .

٤ ـ ره وشتی قسه کردن وپله ی خـوێنده واری وکـارو ئه و زاره کـۆمه لایـه تیه و ناوچه یه هه لٌ ده بژێری له که سێکه وه بۆ که سێکی تر ده گورێ و ئه مانه ش ده بنه هۆی هه مه چه شنی ده نگێك . بۆ نموونه ، گۆرانی بێژ وئه کته ر ره وشتیکی تایبه تیان له قسه کردندا هه یه وخۆیان وا راهێناوه که هه ناسه دان وپشوو وده نگه ده رهێنانیان جیاوازی له خه لکی تر له به ر ئه وه ئاساییه که ئه و ده نگانه ی ئه م جۆره که سانه ده ری ده که ن جیاوازبێ له هی خه لکی تر .

٥ ـ وه نه بی مرۆڤ نه توانی شێوازی قسه کردن وره وشتی له بۆنه یه که وه بۆ بارو دۆخیکی تر نه گۆری . له به ر ئه مه مرۆڤ ده توانێ به ئاره زووی چه ندین جار ده نگێك ده رکات که هیچیان له ویتریان نه کات .

له به ر ئه م هۆیانه ناتوانین بلێین ئه و ده نگه ی که چه ند که سێك دووجاره ده یلێنه وه یان ئه و ده نگه ی که چه ند که سێك ده ری دێنن هه رهه مان ده نگه . به واتایه کی تر دوو ده ربرینی فۆنێمیك هه رگیز کت و مت وه ك یه کـتر نابن وهه رده بێ جیاوازییه ك له نێوانیاندا هه بێ له گه ل ئه مه شـدا له شیکـردنه وه ی زماندا ده توانین ئه م راستیه زانیارییه بخه ین لاوه و هه موو پهلت بوونه وه ی فۆنیك به و فۆنیمه دابنیین ، هه روه ك چۆن به هه موو ( کورسیـیه ك ) ده لێن کـورسی له گه ل ئه وه شدا که هه ریه ی که یان جۆرێکه وله ره نگه وقه واره وجۆری ته خته و بوون ونه بوونی ده سك وپشت و به رزو نزمیدا جیاوازن .

شایانی تی بینیه که زمانه وانه کان له ناو خۆیاندا له سه ر پێناسه ی فۆنیم رێك ناکه ون وهه ندێ جار بیرو راکانیشیان دژی یه کتری ده وه ستن . دیارده ی فۆنیم له چوار روانگه ی جیاوازه وه لێك دراوه ته وه وسه یرکراوه وروانگه کانیش ئه مانه ن (Fudge, 1970, 79 80)

## ٤ ـ روانگه ی هۆشه کی یان ده روونی : ـ

به پێ ی ئه م بۆ چوونه فۆنیم بریتی یه له وده نگه نموونه یی یه که قسه که ر ده یه وی ده ری هێنی بەڵام هه رگیز کت ومت بۆی نایه ته به رهه م له به ر دوو هۆ :

( ۱ ) دوو ده نگی دووپات کراو هه رگیز کت و مت له یه کتری ناچن .

( ۲ ) هه موو ده نگێك له ژێر کاری ده نگه کانی ده وروبه ریدا ده گورێ .

به م جۆره ، هه رچه ند قسه که ریکی کورد ده یه وی ده نگی / ش / له وشه یه کی وه ك ( به شدار ) دا ده رهێنی ، ده وروبه ری ده نگه که وای لێ ده که ن که ئه و ده نگه ی له راستیدا ده رده چێ له ده نگی / ژ / بچێت نه ك / ش / . به واتایه کی تر ، قسه که ر مه به ستی ئه وه یه که / ش / ده ربێنی که چی / ژ / دینێته کایه وه .

ئه م بۆچوونه بۆیه که م جار له لایه زمانه وانی پوڵه ندی ، ( دی کورتنی ) ه وه خراوه ته روو به ڵام جۆرێك له م باوه ره له نووسینه کانی ساپیردا هه ستی پی ده کری به باوه ری دی کورتنی فۆنیم ئه و ده نگه یه که قسه که ر نیازی وایه ده ری بێنی نه ك ئه و ده نگه ی که له راستیدا له ئه نجامی هه وڵه که یه وه دێته ئاراوه .

ئه م رایه له لایه ن هه ندی زمانه وانه وه دراوه ته به ر ره خنه . به باوه ری تواديل پێناسه که ی کورتنی درشت وبی سووده چونکه ناتوانین بگه ینه مێشکی مرۆڤ . دیسان زمانه وانی رووسی ( ترویتیسکۆی ) که سه ربه قوتابخانه ی پراگه له و باوه ره دایه که له پێناسه ی فۆنیم دا ده بێ له ده روون و مێشك دوورکه وێنه ووه له به ر ئه وه ی فۆنیم دانه یه کی زمانیه نه ك ده روونی ، به واتایه کی تردانه یه کی پێره وی زمانه نه ك دانه یه کی بیری له مێشکی قسه که ردا .

له گه ل ئه م ره خنانه دا که له روانگه ی هۆشی ده گیری ، ده بێ دووخاڵی سه ره کی له بیر نه که ین .

( ۱ ) له گه ل ئه وه شداکه زمانه وانه کان ره خنه له دی کورتنی ده گرن که گوایا په نا ده باته به ر مێشك وده روون له پێناسه که یدا ، که م زمانه وانه هه یه به ته واوی له مێشك و ده روون دوور که وتبێتوه و هه موشیان دان به گرنگی ده وری هۆکاری ده روونیدا ده نین له هه ست پێکردنی ده نگی زمانێکی بیگانه دا . بـۆ نموونـه ، هه موو زمانه وانه کان له و باوه ره دان که ده نگه کانی زمانێکی بیگانه له بۆنـه ی

پێره وی زمانی دایکه وه ده بیسهێرێن . به واتایه کی تر ، که منالێکی کوورد
عه ره بی ده کرێ له سه ره تادا ده نگی / ث / ی هه ر وه ك ده نگی / س
گورێ و جیایان ناکاته وه . له به ر ئه وه که ماموستا داوای لێ ده کات ده نگی /
ده رکات ئه و ئاسایی هه رده لێ / س / وخوٚشی به راست ده زانی و هه ست
پێ ده کات که به هه ڵه ی کردبێت . دی کورتنی

( ٢ ) پێناساکه ی دی کورتنی دوو جوٚر جیاوازی ده نگه لێك ده داته وه و
ده کات : ـ

أ ـ ئه و جیاوازییه ی که له ئه نجامی بات کـردنه وه ی ده نگـه وه دێته کـایه
واتایه کی تر ، روانگه که تێمان ده گه یه نی بوٚ وتنه وه ی ده نگێك له ده
خوٚی ناچێ

ب ـ ئه و جیاوازییـانه ی کـه له ژێـر زه بری ده نگی ده و روبه ردا دێته
به واتایه کی تر ، ئی روانینه که ی دی کوریني ده توانی تێمان گه یه نی بوٚچی
وه ك : ـ پشده ر ـ پژده ر
چی بکه م ـ چی پکه م ، چه شتی ـ ده چێژی
بچووك ـ پچووك ) دیارده یه کی ئاسایی و بلاوه له هه موو زمانێکی سروشتی
هه روه ك چوٚن زوورجـار نیشانـه له شتیـك ده گرینـه وه و شتێکی تر ده پێ
به باوه ری دی کورتنی له ده ربرینی و شه یه کی وه ك ( بچووك ) دابـه
تـوانامـانه وه ـ ده مـانه وی ده نگی / ب / لـه سه ره تـاوه ده رهێنین ،
له ژێرکاری ده نگی / چ / دا ، ده نگی / ب / ده رنایه ت چونکه ده نگی
ده یه وی وه ك خوٚی ده نگی / ب / ه که کپ کات ( که / ب / ئاوازه ی
ده گوری به / پ / ) .

## روانگه ی فیزیکی :

به پێی ئه م بوٚچوونه فوٚنیم بوونیکی فیزیاوی هه یه و ئه و ده نگانه ی
فونێمیکن تایبه تی ده نگی ی هاوبه ش کوٚیان ده کاته وه ، به واتـای ئه وه
رووی فوٚنه تیکه وه له یه کتر ده چن .

ئه م بوٚچوونه بوٚیه که م جار له لایه ن دانیال جونزه وه خراوه ته به رده
زمانه وانی ئه مریکیش ، گلیسن له و که سانه یه که په سه ندی ده ک

د)جونز له و باوه ره دایه که فونیم ئه و پۆله ده نگه یه که له رووی فـونه تیکـه وه له یه کتر ده چن ویان لێکجوونی فۆنه تیکی یان تێدایه و تاراده یه کیش ئه ندامانی پۆله که ناچنه شوێنی یه کتری . به م باوه ره بێ فونیم بریتیه له هێمایه ك که چه ند دانه یه کی فۆنه تیکی گرد ده کاته وه . (Fuage , v 79) بۆ نموونه : بزوێنی / ی / کوردی له دوو شێوه ی سه ره کیدا ده بینری و به هه ردوو شێوه که فۆنیمی / ی / پێك دێنن : ( ١ ) / ی / کورت که له برگه ی بێ هێزی کوتایی وشه دا دی و ( ٢ ) ده نگی / ی / درێژ که له شوێنه کانی تردا دی . ( بۆ راستی ئه مه به راوردی هه ندی وشه ی وه ك : قاچی (( شاری ))، (( ده زانی )) له گه ل (( ده چین )) و ((شیر)) و (( ئازایی )) دابکه . له کۆمه لّه ی یه که مدا ده نگه که کورته ، له دووه مدا درێژ .

شایانی تێ بینی یه که ئه م دووشێوه یه هاوبه شی فۆنه تیکیان زۆره . بۆ نموونه ، هه ردووکیان له وبزوێنانه ن که به رزن وپێشه وه ی زمان دروستیـان ده کات لێـو خرنابێت له گه لیاندا . ته نیا جیاوازییان له کورتی و درێژییان دایه . دیسانـه وه مه رجی دووه میشیان تێدایه چونکه ناچنه جێگه ی یه کتری : / ی / کورت ته نیا له برگه یه کی بێ هێزی کۆتایی وشه دا ده بینری و / ی / درێژ له شوێنی تردا جگه له م شوێنه . به واتایه کی تر ، وه ك به راورد کردنی / قاچی / له گه ل / ئازایی / دا بۆمان ده رده خـات ، له کـۆتایی وشـه دا / ی / ـ کورت لـه گه ل بـرگه ی بێ هێزدایه ـ ( قا . چی ) به لام / ی / ـ درێژ که ده که وێته کۆتایی وشه وه ده بێ برگه که به هێزبێت وه ك / ئا . زا . یی ) .

شێوه یه کی روانگه ی فیزیکی ( بۆچوونه که ی د . جونز ) ته واو سه رکێشه و له پۆلێن کردنی ده نگدا گوی له راستی فۆنه تیکی به ولاوه به هیچ بنه مایه کی تر نادات ویه هیچ جۆی رێگه ی واتا و راستی رێزمانی نادات له ناسینه وه ی فۆنیمدا ده وریان هه بێت ، هه رچه نده هه رگیز ناتوانی له واتاش ده ست به ردار بێ . به رای ( جونز دانانی ده نگی / و / و / و / به دوو شێـوه ی فۆنیمی / و / لـه کوردیـدا ، ( به راوردیکی ئه م دوو پۆله وشه یه بکه تا جیاوازی نیوان ئه م دوو ره نگه ت بـۆ روون بێته وه (( وه ره )) و (( ساوا )) و (( شه و )) (( له گه ل وێران )) ، (( خوێن )) ، (( گوێز )) دا . . . . . ) په یوه ندی به وه وه نی یه که ئه م دوو ده نگه واتای وشه جیا ده که نه وه ، به لّکو زیاتر له به رئه وه یه که هه ردووکیان نیوه بزوێنێکی ئاوازه دارن لێو خرکردنه وه یان له گه لّدایه ( به واتای ئه وه ی له رووی فونه یتکه وه

له یه کتر ده چن ) . له راستیدا ئه م لیکدانه وه یه بیری فونیم ناسور نه تب و کاره کیش نی یه ( عـه مه لی ) چـونکه پـۆلین کـردنی فۆنیمـه کان بمـانه وی یـان نه‌مانه وی هه ر له سه ر بناغه ی واتا جیاکردنه وه ده بێ .

ئه م بۆ چوونه چاری ئه و جیاوازییانه ده کات که له ژێـر کاری راوسییـه تی ده نگه کاندا نه هاتوه‌ته ته کایه وه‌به‌لام جیاوازی ده ربرینمان له قسه که رێکه وه بۆ قسه که رێکی تر بۆ لێك ناداته وه .

## ( ۳ ) روانگه ی ئه رکی :

به پێ ی ئه م بۆ چوونه فۆنیم نه به هۆی هه ڵکه وتنی ده روونیه وه نه به هۆی لێکچوونی فۆنه تیکیه وه پێناسه ده کرێ به‌ڵکو ته نیا له سه ر بنه مـای ئه و ئـه رکه ده کری که فۆنیمه که له زمانیکدا ده بیینی . به م پی یه ، فۆنیم بچووکترین دانه یه که ئه رکی جیاکردنه وه ی واتا ده گریته ئه ستۆ . فۆنیم نه ده نگه و نه خێزانه ده نگه به ڵکو دانه یه کی رووتی ( مجرد ) تیوریيه له ئـاستی فۆنـوڵوجیـدا به پێ ی ئـه و جیاوازییانه ی له زمانه که دا به دی ده هێنی دیاری ده کرێ .

ئـه م بۆ چـوونه کت ومت پێچـه وانه ی بـۆ چوونی فیـزیکیه چـونکـه واتا جیاکردنه وه داده نی به بنه مای سه ره کی له ناسینه وه ی فۆنیمدا .

بـه م پێ یه لـه به ر ئـه وه ی ده نگی / خ / و / غ / له زاری سلیمـانیدا واتـا جیاناکه نه وه ، وه ك ئه م جووته وشانه ده ری ده خه ن ( باغ / باغ و باخجه / باغجه و داغ / ، ئه م دوو ده نگه نابێ به فۆنیم دابنرێن به ڵکو ده بێ به‌دوو شێوه ی جیاوازی تاکه فۆنیمی بن ، به لام له به ر ئه وه ی له زمانیکی وه ك عه ره بیدا ئه م دوو ده نگه واتا جیاده که نه وه ( بروانه وشه ی غالی / خالی ) ده بێ وه ك دووفۆنیمی جیاواز سه یر بکرێن .

دیسانه وه له م جۆره بۆ چوونه دا فۆنیم نابێت به خێزانه ده نگ دابنرێت چونکه له هه ر به رامبه رییه کدا ته نیا هه ندی تایبه تی ده نگه که نه هه موو تایبه تیه کانی واتا جیاده که نه وه و فۆنیم بریتیه له چه ندین له م تایبه تییانه ( سیمای جیاکردنه وه ) . بۆ نموونه ، هه موو فۆنیمه کانی وشـه یه کی وه ك ( بـار ) ئاوازه دارن به لام ئاوازه داری ته نیا له ده نگی یه که مدا سیمایه کی جیا کردنه وه یه چونکه ته نیا

لێره دا نه مانی ئاوازه ده بێته هۆی دروست کردنی وشه یه کی نوی . ( بروانه : پار ) . هه رکه رتێکی تری ده نگه کان کپ بکه ین ته نیا شێوه یه کی شێواوی وشه ی (بار ) ده رده چێت به لام وشه یه کی تری کوردی نایه ته کایه .

## ( ٤ ) روانگه ی رووت ( مجرد ) :

به پێ ی ئه م بۆچوونه دیاری کردن و ناسینه وه ی و پۆلین کردنی فۆنیم نابێت به هۆی بنه مای فۆنه تیکه وه بێت به لکوده بێ به هۆی هۆکاری تره وه بێت وه ك : ـ

### ١ . ره فتاری مۆرفۆلۆجی ده نگه کان :

بۆ نموونه ده نگی / ش / ده بێت به / ژ / له هه ندی شویندا ( بروانه ((شه ش )) و (( شه ژجار )) ) ، به لام له به ر ئه وه ی ئه م دوو ده نگه له زۆر شـوینـدا به رامبه ر یه کتری ده وه ستن ( بروانه : شه نگه / ژه نگه ، شوان / ژوان ، وشه / وژه ، ( گه ردن ) که ش / که ژ ، . . . . هتد . به پی ی ئه م روانگه یه ئه مه له خویدا به سه بۆ ئه وه ی که ئه م دوو ده نگه به دوو فۆنیه ی جیاوز دابنیێن . ئه م بریاره په یوه ندی به لێکچوونی فۆنه تیکی دوو ده نگه وه نی یـه چونکـه ئه گـه ر له سه ر بناغه ی فۆنه تیکی سوور بین ، ده بێ ئه م دوو ده نگه به یه ك فۆنیم دابنێین له به ر ئه وه ی تایبه تی فۆنه تیکی هاوبه شیان زۆره ، به واتایه کی تر له زۆر رووی فونه تیکه وه له یه ك ده چن .

### ٢ لێکچوون و جیاوازی له دابه ش بووندا :

ئه م بنه مایه زیاتر بۆ پولێن کردنی فۆنیم به کاردی بۆ نموونه ، به پێ ی بنه مایه ی دابه ش بوون له سه ره تای وشه دا ته نیا ئه و هێشووه نه بزوینانه لـه رووی فونـه تیك و فـۆنولـوجیه وه نـه گورن کـه که رتی دووه میان ده نگی / و / یان / ی / یه . به لام له رووی فۆنه تیکه وه بوونیان نی یه ( به واتای ئه وه ی هه میشه نیوه بزوێنێکی کورت له نێوان کـه رتی یه کـه می و دووه میانـدا هه یـه ) . بۆ سـه لمانـدنی ئه م رایـه

به راوردیکی ئه م وشانه بکه : چوار ، گیان ، شوان ، خوا له گه ل :
گلان ، پلاو ، شتن ، زمان ، چلکاو ، بر ، پر . به پی ی ئه م روانگه یه
ئه م ره فتاره له خویدا به سه بو ئه وه ی که ده نگی / و / و / ی / به
یه ك پول ده نگ دابنین ( نیوه بزوین هه رچه نده له رووی فونه تیکیشه وه
جیاوازین ، له به ر ئه وه ی له دابه ش بووندا لـه چوارچیـوه ی وشه و
برگه دا وه ك یه ك ره فتار ده که ن له کوردیدا ، ده بی له یه کتر بچن و
سه ربه کومه لیك بن .

## ئه لوفون :

په یوه ندی نیوان فونیم ئه و ده نگه زمانیانه ی پیکی دینن له دوو روانگه وه لیك
ده دریته وه . ئه گه ر له شیکردنه وه ی راستیه زمانیه کاندا له ده نگـه وه ده ست
پی بکه بن ، ئه وا ده توانین ئه و ده نگانـه ی که فونیمیك پیـك دینن هه مـوومان
بخه ینه ژیر بالی فونیمیکه وه و به هه ریه که یان بلیین (( ئه لوفون )) . هه ر فونیمیك
به لای که مه وه ده بی ئه لوفونیکی هه بیت . بی گومان زوربه ی فونیم دوویان سی و
بگره زیاترشیان هه یه . خو ئه گه ر له فونیمه وه ده ست به شیکردنه وه ی زمان
به که ین و له مه وه بـه ره و ده نگه زمـانییه کـان بروین ده تـوانین هـه موو ئـه و
ده نگانه ی فـونیمیك ده نـوینن به چـه ند شیـوه یه کی فـونیمه کـه ی دابنرین کـه
هه ریه که یان شوینیکی تایبـه تی ده گرن ، بـه واتایـه کی تر هـه ریه کی لـه م
شیوانه ی فونیمه که له ده وروبه ریکدا ده بینری و ناچیته ده ورووبه ری تره وه و جی
گورکی ناکات له گه ل هاو ده نگه کانی تری فونیمه که دا ، بو نموونه ، فونیمی / و
/ له کوردیدا به پی ی شوین یان ده وروبه ر له دوو شیوه ی جیاوازدا خوی ده نوینی
: ( ۱ ) ( و ) که نیوه بزوینیکی ئاوازه داره که به هوی لیور نه رمایی مه لاشوه وه
دروست ده بی ولیو له گه لیدا خر ده وه ستی ( ۲ ) ( و ) که نیوه بزوینیکی ئاوازه داره
که وه ك بزوینیکی ئاسایی به رزه و له پیش زماندا دروست ده بی . بـه هه ردوو
شیوه که فونیمی / و / له کوردیدا پیك دینن و هه ریه که یان له شوینیکی تایبه تیدا
ده بینری و جی ناگورنه وه ، دووه میان به دوای هه موو بزوینیکی به رزو پیشه وه

دادی ( ی ، ی ) ویه كه میان له هه موو شوێنیكی تردا . بۆ روون كردنه وه واله خواره وه به وێنه دابه ش بوونی و / له كوردیدا پێشان ده ده ین :

و ←── /هه موو شوێنیكی تر ( ساوا ، وه ره )

و ←── / + به رز + پێشه وه ( خوێن ، گوێز ، وێران )

بۆ ئه وه ی بزانین دوو ده نگ دوو فۆنیمی جیاوازیێك دێنن یان هه ردووكیان سه ربه فۆنیمیكن له زمانیكدا ده بێ به دوای ئه و بارو دۆخانه دا بگه ڕێین كه تییاندا گۆرینه و ی ده نگیك له مانه به ده نگه كه ی تریان ده بێته هـۆی گورانی واتـا .

ئه گه بارو دوخێكی واهان له زمانه كه دا دۆزییه وه ، ئه وا ئه و دوو ده نگه نابێ سه ر بـ یـه ك فۆنیم بن ئـه گه ر بـارو دوخـی واش چنگه نـه كه وت ، ئـه وا به پێچه وانه وه دوو ده نگه كه سه ر به فۆنیمێك ده بن . بۆ نموونه ، له كوردیدا بوونی جووته وشه ی وه ك / كه ڕو كه ر / وامان لی ده كات كه ئه م دوو ده نگه / ڕ / و / ر / به دوو فۆنیمی جیاواز دابنێین به لام له زمانی عه ره بیدا هه مان دوو ده نگ ده بنه ئه لۆفۆنی فونێمی / ر / چونكه له و زمانه دا جووته وشـه یه كمـان ده ست ناكه وی به گۆرینه وه ی شوینی ئه م دوو ده نگه واتاكانیان بگۆری . چاكترین ریگه بۆ ساغ كردنه وه ی كێشه ی ئه لۆفۆن و فۆنیم دۆزینه وه ی جووته وشه یه . ( دوو وشه كه ته نیا له یه ك ده نگدا جیاوازییان هه بێت وه ك : شه نگ / زه نگ یان په له / په ڵه یان كه ڕ / كه ر . . . . . . . . هتد ) خو ئه گه ر جووت وشه مان ده ست نه كه وت نه بێ گومان له وه په یدا بكه ین كه دوو ده نگه كـه فۆنیمن . ئـه وسا به هۆی لیكچوونی فۆنه تیكیه وه ده توانین بیسه لمێنین كه دوو ده نگه كه ئه لۆفۆنی فونیمیكن یان هه ر یه كه یان سه ر به فونیمیكن .

زۆر جار له پۆلێن كردنی و دابه شكردنی ده نگدا په نا ده به ینه به رێك وبێكی له به شه كانی تری پێره وی ده نگی ی زمانه كه دا بۆ چه سپاندن و سه لماندنی هه ندی بریار بۆ نموونه ، له كوردیدا جووته وشـه یه كی وامـان ده ست ناكـه وی پله ی ده نگی / خ / و / غ / له زمانه كه دا ده رخـات و بیسه لمێنی فونێمن یـان دوو ئه لۆفونی تاكه فونێمێك . به پێچه وانه شه وه ، له به ر ئه وه ی لـه سه ره تـاو ناوه راست و كۆتایی وشه شدا ئه م دوو ده نگه جێگه ده گورنه وه بی ئه وه ی واتا بگورن ( بروانه : خه ڵوز : غه ڵوز ، باخچه / باغچه ، داخ / داغ . . . هتد ) له گه ل ئه ئه وه شدا كه له هه ندی وشه دا هه ریه كیكیان دی ( بروانـه غار / خـار ) .

به هه موو جۆریك ده بی ئه م دوو ده نگه پله ی ئه لوفونیان بدریتی که چی هه موو زمانه وانه کان ریکن له سه ر ئه وەی که ئه م دوو ده نگه فونیمن . له م بـریاره دا زمانه وانه کان په نایان بردوته بەرریك و پیکی لەدابه ش بوونی ده نگه ده ربازه کانی کوردیدا : کوردی ( ۹ ) ده نگی به خشپه ی هه یه ، هه ر دووانیان له شوینیکدا دروست ده بن ، وله م دووانه یه کیکیان ئاوازه داره و ئه وی تریان کپ . هه ر له به ر ئه وه ی ئه م دابه ش بوونه به شیوی ، زمانه وانه کان ده نگی / خ / و / غ / شیان وه ك ئه مانه داناوه به دوو فونیم ( به خشبه ) که هه ردووکیان له شوینیکی ده مدا دروست ده بن ویه کیکیان . / خ / کپه وئه یتریان / ئاوازه دار وه ك له م نه خشه یه ی خواره وه دا ده رده که زی .

| | لێوه کی | دانه کی | بیخ و وه قایی | نه رمایی مه لاشوو | دوانر |
|---|---|---|---|---|---|
| ده نگی به خشپه Fricatives کپ | ف | س | ش | خ | ح |
| ئاوازدار | ڤ | ز | ژ | غ | |

### ٣ ـ سیمای جیاکردنه وه :

له به ر ئه وەی ئه نداماتی ئاخاوتن ده توانین به رده وام بجولین ، مرۆڤ ئه و توانایه ی تیدایه که ژماره یه کی بی سنوور ده نگی زمانی ده ربکات . بۆنموونه ، هه ر له نیوان بزوینی به رزی / و / وبزوینی نزمي / ە / دا مرۆڤ ده توانی ده یان بزوێنی تر ده رکات که له یه کتری جیاوازبن . هه روه ها بۆ ده رکردنی نه بزوینـه ده ربازو به خشبه کانیش کۆسپ وته نك ده توانی دریـژایی ده م و قورگـدا بلاو بکاته وه وله هه ر کۆییه کی ئـه م ناوه دابی ده نگی ده ربـازو به خشپـه ده رکات ئاشکراشه که مرۆڤ تا راده یه ك که لکیکی زۆرکه می له م توانایه ی وه رگرتووه

چونگە تە نیا هە ندیَ لە م دە نگانە ی خستوَتە کارو زوَر جیاوازی وردی فوَنە تیکیَ دە خاتە لاوە و بە کاریان ناهیَنی لە زماندا بوَ نموونە ، ئە وانە ی بـە کوردی قسـە دە کە ن کە فیَری روَنانی فوَنوَلـوجی کوردی دە بن بـە وە رایە ن کـە گوی بـدە نە ئاوازە داری کپی دە رباز چونکە ئە م کپی و ئاوازە دارییە کە / ت و د / و / ب و پ / و / ك و / / لە یە کتری جیاکردوتە وە وبە هوَی ئە مانە شە وە یە کە دە توانین (بان و یان و دار / تار وکە ل / گە ل ) بە وشە ی جیاجیا دانیَن . دیسانە وە کە فیَری روَنانی فوَنوَلوجی کوردی دە بن ، بە وە ش رایە ن کە گوی نە دە نە هە ندی سیمای تری دە نگ بوَ نموونە قسە کە ری کورد فیَری ئە وە بووە کە گویَ نە داتە دە نگی /تِ / ئاسایی و ئە و / ت / یە ی بە رلیَو دە دویَ چونکە هە رگیز جووتە وشە یە کی کوردی نادوَزینە وە کە جیاوازی ئە م دوو جوَرە / ت / ە لە یە کتری جیایان بکاتە وە . بە و جیاوازییە ی کە قسە کە ر گوَی ی پی دە دات ودە ور دە بیَنی ناسینە وە ی موَرفیم وجیاکردنە وە ی دادە وتری (( سیمای جیاکردنە وە )) لە رانە وە ی دە نگـە ژی یە کان سیمای جیاکردنە وە یە الە دە نگە دە ربازە کانی کوردیدا بە لام هە مان تاییە تی بە سیمای جیاکردنە وە دانانری لە ناسینە وە ی دە نگە شلە کاندا ( ل و ڵ ) یا ( ر و ڕ ) چونکە بە پیَ ی کپی و ئاوازە داری ئە م دە نگانە لە یە کتری دانە برین هە روە ها بە رلیَودان یان بە لیَو نە دان سیما جیاکردنە وە نی یە لە فوَنوَلوجی کوردیدا .

سیمای جیاکردنە وە بە رامبە ر یە کتری دە وە ستن ، بە واتای ئە وە ی موَرفیمیَك لە یە کیَکی تر جیا دە کە نە وە . لە کوردیدا دە نگی / س / بە رامبـە ر / ز / دە وە ستی بە وە ی کە لە شویَن ویَگەر دە رهیَناندا وە ك یە کن بە لاَم / س / کپە و / ز / ئاوازە دار . هە روها / س / بە رامبە ر / ف / دە وە ستی بە وە ی کە لە شویَنی دە رهیَنـاندا جیـاوازن ( / س / دوای بیخی دانە . / ف / لیَـوو دانە کی ) ، هە رچە ندە هە ردووکیان بە خشپـە ن . دیسانـە وە / س / بە رامبـە ر / ت / دە وە ستی بە وە ی کە / س / بە خشپە یە و ( تە نگە ی دە وی لە دە ما ) / ت / دە ربازە ( پیَویستی بە کوَسپە لە دە ما ) لە دووسە ریشە وە / س / بە رامبە ر دە نگی / د / دە وە ستی کپی و ئاوازە داری و بە خشپە یی و دە ربازی . Langacker ) s157 )

ژمارە یە کی کە م لە سیمای جیاکردنە وە هە موو ئە و دە نگانە جیا دە کاتە وە کە گرنگیان هە یە لە زمانیَکدا ( فونیَمە کانی زمانیَك ) . هە ر ئە م سیمایانە شە کـە

گوێیان ده درێتێ له فێربوونی زمانێکدا و هه موو سیمایه کی تر ده خرێته گـوی .
شایانی تێ بینی یه که زمانه کانی جیهان وه ك یه ك ره فتار ناکه ن بـه رامبه ر ئـه م سیمایانه ، وه واتای ئه وه ی ئه و سیمایه ی که له زمانێکدا گرنگه لـه وانه یـه له زمانێکی تردا بخرێته پشت گوێ . بۆ نموونه ، له کوردیدا ده نگی ده ربازوو به خشیه به پێ ی سیمای ئاوازه داری جیاده کرێته وه چونکه ئه مه هه ندی فۆنیم له یه کتری جیاده کاته وه ( تاو و داو ، فـاول / ڤاول ) لـه زمانی تـردا مه رج نی یـه کپی و ئاوازه داری ئه م گـرنگیه ی درابێتێ . دیسـانه وه لـه زاره کانی نـاوه راستی زمانی کوردیدا گرنگی نادری به جیاوازی نێوان ده ربازی سووك وده ربازی قورس چونکه جووته وشه ی تێدانی یه که ئه م جیاوازییه له یه کتریان جیاکـاته وه . بـه لاّم له زاره کانی سه رووی کوردیدا ده ربازی قورس و سـووك گرنگی دراوه تێ چـونکه سووکی و قورسی ده ربازمۆرفیم له یه کتری جیاده کاته وه . دیسـانه وه سیمـای به رنه رمه دان له هه ندی زاردا که لُکی لێ وه رناگری ( بۆ نموونه ، زاری کۆیه و هه ولێر ) . به لاّم له هه ندێکی تردا ( وه ك زاری سلیمانی ) به ر نه رمه دانی ده نگه شله کان ( ل ، ر ) سیماجیاکردنه وه ی ( په له و په لُه ، برین وبرِین . . . . . . )
هه روه ها له ئینگلیزیدا به لای که مه وه سێ پله به رزی سیمان جیاکردنه وه ی له بزویندا ( به رز ، نیوه به رز ، نزم ) ، به لاّم له کوردیدا ته نیا دوو پله ( به رز و نزم ) بۆ جیاکردنه وه ی بزوینه کانی کوردی به کارێن . به م جۆره ده بین به های نه رم کردن و به رمه لاشوودان و په رنه رمه دان و به رلێـودان و ئاوازه داری و کپی لـه زمانێك وه بۆ زمانێکی تر یان له زارێکه وه بۆ یه کێکی تر ده گورێ .
که مۆرفیمێکی نوێ فێرده بین ته نیا گوی ده ده ینه ئه و سیمایانه ی که له فۆنێمی تری جیای ده که نه وه . ئه وتاییه تیانه ی که هۆی یاسای گشتی زمانه که وه ده دری به فۆنیم توانای جیاکردنه وه یان نی یه و گوێیان نادرێتێ بۆ نموونه ده نگی / پ / له وشه ی / پی / دا له رووی فۆتیکه وه له و ده نگانه یه کی ده ربازه و لێوه کی یه و کپه و قورس ده ربازی و لێوه کی وکپی سیمای جیاکردنه وه ن ( وشه ی ((پی )) له (( دی )) و (( زی )) و (( بی )) جیاده که نـه وه ) . بـه لاّم قـورسی سیمـای جیاکردنه وه نی یه ، چونکه به هۆی یاسایه کی گشتی کوردییه وه پێش بینی ده کری (هه موو ده ربازێکی کوردی له هه موو شۆینیکدا قورسه ) . دیسانه وه یه کێك له بنه ما فۆنۆلۆجیه کانی کوردی ئه وه یه کـه ئه و بـزوێنانـه ی به رزن وپشتی زمـان

دروستیان ده کات ( و /       / و / ئـۆ ) لێو لـه گه لیـاندا خـر ده کرێت . بـه پێچه وانه شه وه بزوێنه کانی پێشه وه لێو گرموّل کـردنیان لـه گه ڵـدانی یه . ئـه م ... ڵـکه وته ی بزوێنه کانی کوردی پێویست نی یه له گه ل هه موو فۆرمێکدا له به ر بکری ، له ده ربرینی وشه یه کی وه ك / کی / دا ، قسه کـه ر هه ر ئـه وه نده ده زانی که بزوێنه که له وانه ی پێشی زمانه و ( به مه له / کۆ / جیاده بێته وه ) به رزه ( به مه له (( کا )) و (( که )) جیاده بێته وه ) به لاّم پێویستی به وه نابی که بزانی لێو خرکردنه وه ی له گه لدا نی یه چونکه لێو خرکردنه وه یان نه کردنه وه سیمایه کی جیاکردنه وه نی یه و به یاسایه کی گشتی پێش بینی ده کری له کوردیدا .

ئه و تایبه تیه ی که له شوێنیکی مۆرفیمێکدا سیمای جیاکردنه وه یه مه رج نی یه له شوێنی تریشدا مۆرفیم له یه کتری جیابکاته وه . بۆ نموونه ، کپی و ئاوازه داری له ده ربازدا له کوردیدا سیمایه کی جیاکردنه وه یه له زۆربه ی شوێنه کاندا ( بروانه یان / پان ، لـه ب و له پ . . . . . هتـد ) . به لاّم لـه چوارچیـوه یه کـدا که ده نگیکی کپی تـری به دوودا بێت ، ئـاوازه داری ئه وه ده کـه وی کـه مـۆرفیم جیابکاته وه ( بروانه ـ چی بکه م ؟ چی بکه م ) . له م شوێنه دا جیاوازی نیوان کپی و ئاوازه داری (( له کـار خراوه )) ، بـه واتای ئـه وه ی جیاوازی نێـوانیان به کارنایه ت بۆ په یوه ندی کردن ( واتا گه یاندن ) .

ئه و راستیانه ی سه ره وه ئه وه مان بۆ ده رده خه ن که فۆنیم که رت ده کری بۆ بارچه ی وردتـر له خـۆی و هه ر فـۆنتیك پێـك هاتـووه له کـۆمه ڵه سیمایـه کی جیاکردنه وه بۆ نموونه ، مۆرفیمێکی وه ك (( پان )) له رووی فۆنۆلۆجیـه وه به م جۆره ی خواره وه ده توانری پیشان بدرێت .

له رووی فۆنۆلۆجیه وه به م جوره ی خواره وه ده توانری پیشان بدرێت .

| پ | آ | ك |
|---|---|---|
| ده رباز | پێشه وه | كب |
| كپ | نزم | ده رباز |
| لێوه كی | بزوین | نه رمۆك |

لێره دا هه ر ئه و سیمایانه ی ده نگه كه مان پیشان داوه كـه ب و جیاكـردنه وه به كاردێن . ده بێ ئاگه داری ئه وه ش بین كه ئه م ده نگانه ، ئه گه ر لـه رووی فۆنه تیكه وه وردلێك بده ینه وه ، جگه له م سیمـای جیاكـردنه وانـه ، تایبـه تی تریشیان تێدایه وه ك تایبه تی قورسی له كـه رتی یه كـه مداو تـایبه تی ده رنـه برین له كه رتی سێه مدا . ئه م نه خشه یه ی سه ره وه روۆنانی فۆنۆلۆجی مۆرفیمی (( پاك )) پیشان ده دات نه ك روۆنانی فۆنه تیكی كه ئاسایی راستی وردترمان ده داتێ .

## ٤ - برگـــه :

برگه زیاتر له هه مـوو دانه كـانی تری زمـان قسه ی لـه سه ره هـه ر چه نـده له هه مووشیان كۆنترو ناسراوتره . له گه شه ی فۆنۆلۆجیدا برگه مێژ وویه كی پر له گیروگرفتی هه بووه . هه موو ئه وه ه وڵدانه ی دراوه بۆ دانانی پێناسه یه كی فۆنه تیكی یان فۆنولۆجی برگه سه ركه وتو نه بوون ونه یـان توانیـوه چاری بـۆ هه مـوو ئه و دیاردانه بدۆزنه وه كه به برگه وه به ندن . ئه م كێشه یه وای له هه ندی زمانه وان كردووه كه برگه به كه ره سه یه كی ناپێویست دابنێ له گه ل ئه وه شدا كه به لگـه له سه ربوونی برگه زۆره . هه ندی زمانه وانی تر برگه به دانه یـه كی بێ كه لـك له زانستی زماندا داده نێن . هه ندێكی تر وابه باشتر ده زانن كه هه ر به ته واوی بیخه نه لاوه و له خوێنی دوور خه نه وه به وه ی دان به بوونی هیـچ دانه یـه كی رێكخستندا نه نێن له نێوان كه رت ( فۆنیم ) ووشه دا ( چومسكی وهالی ١٩٦٨ ) .

ئه م باوه رانه ی سه ره وه ده رباره ی برگه ده گه ڕێته وه بۆ چه ند هۆیه ك جگـه له نه بوونی پێناسه یه کی وردی دیارده که :

( ١ ) له هه ندێ زماندا دیاری کردنی سنووری برگه شتێکی زۆر ئاڵۆزو گرانه .

( ٢ ) له گه ل ئه وه شدا که برگه دیارده یه کی زۆر بلاوه له زمانه کانی جیهاندا ، زمانه وانه کان تا ئێستا رێك نه کـه وتوون تـاچی راده یه ك وچـه ند لـه م بنه مـا جیهانیانه ی برگه ببه نه ناوتیوری فۆنـۆلۆجیه وه .

( ٣ ) یه کێك له به لگه هه ره گرنگه کانی بوونی برگه ئـه وه یه کـه قسه کـه رانی زمانێك به ئاسانی هه ستی پێ ده که ن وده توانن نه ك هه ر ژماره ی برگه ی گوتنێك دیـاری بکه ن بـه ڵکو لـه ناو خـۆشیانـدا لـه سـه ر ژمـاره کـه رێـك کـه ون . لێکوڵینه وه کانی ئه م دواییه به تایبه تی ئه وانه ی لیبرۆن ( ١٩٦٦ ) ، ئه م باوه ره ی به ته واوی ره ت کردۆته وه وبه به لگه وه ده ی سه لمێنی لـه زۆر زمانـدا خه ڵکی له ناو خویاندا له سه ر ژماره ی برگه رێك ناکه ون .

ئه م هۆیانه ی سه ره وه ئه وه ناگه یه نن که برگه نی یه یان دانه یه کی بی که ڵکه له زمانه وانیدا . به پێچه وانه وه ، زمانه وانی ناتوانی واز له برگه بێنی له به ر چه ند هۆیه کی وه ك :

١ ـ هه موو که سێك یان قسه که رێکی زمانێکی دیاری کراو هه ست به وه ده کات که له زمانه که یدا برگه هه یه . هه ندی جار بێ ئاگایانه ئه م راستی یه ده سه لمێنی (بۆ نموزنه ، که هه ڵه ده کات جێگه ی برگه کـان ده گۆری ) دیسـانه وه هـۆنراوه به لگه ی ته واوی ئه م به ئاگابوونه یه .

٢ ـ هه ندی یاسای زمان به تایبه تی ئه و یاسایانه ی که په یوه ندییان به شوێنی هێزو درێژی ی ده نگه وه ستان ورژانه ناویه ك ودابه ش بوونی فۆنیمه وه هه یه له زۆربه ی زمانه کانی جیهاندا به پێی برگه دانراون . لابردنی برگه ناچارمان ده کات که ئه و یاسایانه ش بگورێن وبه جۆری تر ده ریان برین . ئه مه ش شتێکی ئاسان نی یه وتائێسته ش برێتیه کی سه رکه وتوو بۆ برگه نه دۆزراوه ته وه .

٣ ـ له به ر ئـه وه ی زمانـه وانی باوه ری بـه وه هه یـه که زمـان قسه یـه ، ده بێ باوه ریشی به وه هه بێ که برگه دانه یه کی به که ڵکه ، چونکـه برگـه له قسـه دا که لکی لی وه رده گیری . ئه گه ر فـۆنیم ده رنه بـری ( گۆنـه کرێ ) ، ئه وا

ده توانین واز له برگه بێنین ، به لاّم به لگه نه ویسته که ده نگی زۆربه ی فۆنیمه کانی زمان به ته نیا به ته واوی گۆناکرێن .
بۆ غوونه ، ده نگی / ك / زۆر به گران ده رده بری ئه گه ر بزوێنێکی له گه لدا نه بێ له پێشیه وه یان دواوه ، هه روه ها ده نگی / ت / ، هه رچه نده ده توانرێت به ته نیا ده رببرێت ، به لاّم ئه وه نده نزم وکپ ده رده چێت برناکات بۆ یارمه تی ده نگێکی بزوێن . که واته کۆبونه وه ی بزوێن ونه بزوێن ودروست کردنی دانه یه ك له ئه نجامی ئه م کۆبونه وه یه دا یه کێکه له و بارانه ی که قسه کردن هێناویتی یه کایه وه وده بێ دانی پێدابنرێ .
به دوو شێوه ده توانین له برگه بکۆلینه وه : ـ ( Malmberg , 209 - 212 )

## ١ ـ شێوه ی فۆنه تیکی :

له م شێوه یه دا ئه و یاسایانه ی بۆ برگه ی داده نرێ په یوه ندی به زمانێکی دیاری کراوه وه نابێ به لَکو شێوه یه کی گشتی وه رده گرێ ووا چاوه ری ده کرێ که به که لَکی هه موو زمانی بێ . هه ر له به ر ئه م هۆیه شه که ه م وکورتیه کی زۆری تێ ده که وێ وهه رگیز به ته واوی ناتوانی سنووری برگه مان بۆ دیاری بکات ، به تایبه تی که سنووری برگه خۆشی شتێکی له گۆڕ ن یه وبه پێ ی شێوازی قسه کردنیش له ناو تاکه زمانێکیشدا ده گۆری . که به شێوه ی فۆنه تیکی له برگه ده کۆلینه وه دوو جۆرتیۆر دێته کایه وه :

### أ ـ تیوری ده رکه وتوویی ده نگه : ـ

به پێ ی ئه م تیوره له وبرگانه دا که له ده نگی زیاتر پێك دێن یه کێك له م ده نگانه ده رکه وتوویی زیاتر ده بی له وانیتر . ئه گه ر ته نیا یه ك ده نگی ده رکه وتوومان له وشه یه کدا هه بێ ئه وا ئه و وشه یه به یه ك برگه یی داده نرێ خۆ ئه گه ر دوو ده نگی ده رکه وتوویان زیاتر هه بووه ئه و وشه یه فره برگه یيه ، به واتای ئه وه ی له چه ند برگه یه ك پێك هاتووه . ده نگی ده رکه وتوو مه رج نی یه هه ر بزوێن بێت ، هه رچه نده بزوێن له نه بزوێن ده رکه وتوتره . ده رکه وتوویی ده نگه ده گه رێته وه بۆ چه ند هۆیه ك :

١ ـ ئاوازه داری : ده نگی ئاوازه دار ده رکه وتویی زیاتره له ده نگی کپ . بۆ نموونه فۆنیمی / د / له / ت / ده رکه وتووتره .
٢ ـ درێژی : تا ده نگی درێژ تربیت ده رکه وتوویی زیاتر ده بی . بۆ نموونه فۆنیمی / آ / له / ه / ده رکه وتووتره .
٣ ـ هێز : ئه و ده نگه ی هێزی له سه ره ده رکه وتویی له ده نگه کانی تر زیاتره . بۆ نموونه ، ده نگی / ی / دواوه ی وشه ی (( بیرتیژ )) له ده نگی / ی / پێشه وه ده رکه وتووتره له به ر ئه وه ی هێزی وشه که ی له سه ره .
٤ ـ دوورو نزیکی له و ده نگانه ی که ده رکه وتوون . تاده نگه له ده نگێکی ده رکه وتووه وه نزیك که وێته وه ده رکه وتووی خۆی که م ده بێته وه . به پێچه وانه شه وه ، ئه گه ر ده نگی بچێته پاڵ ده نگێکی ده رنه که وتووه وه ، ئه وا زیاتر ده رده که وی . بۆ نموونه ، به شی له ده رکه وتویی ده نگی / ر / له وشه ی ( ترێ ) دا له وه وه هاتووه که چۆته پاڵ / ت / که ده نگێکی ناده رکه وتووه .
به پێ ی تیۆری ده رکه وتویی ده رکه وتویی ده توانین بلێین برگه بریتیه له کۆمه ڵه ده نگیك که یه کێکیان له هه موو ئه وانیتر ده رکه وتوتربێت . به شێوه یه کی گشتی ، ده نگه کانی زمان به پیی ده رکه وتویی له که مه وه بۆ زۆر به م پێیه ریز ده بن :
١ ـ ده ربازه کان / پ ، ت ، ك ( کپه کان ) .
به خشپه کان / ف ، س ، ش
ئه فریکیتی کث / چ /
٢ ـ ده ربازه ده نگداره کان / ر ، د ، گ /
به خشپه ی ده نگدار / ڤ ، ز ، ژ /
ئه فریکیتی ده نگکدار / ج /
٣ ـ ده نگه کانی ناولووت : / م ، ن ، /
٤ ـ ده نگه لاوه کییه کان / ڵ ، ل /
٥ ـ ده نگه له رزوکه کان / ڕ ، ر /
٦ ـ بزوینه به رزه کان / ی ، وو / ونیوه بزوێنه کان / و / ی /
٧ ـ بزوینه کانی نێوان / و ، ه ، ی /

٨ - بزوینی / آ و ئۆ / . . . . . ئه م دووانه هه ره ده رکه وتوون .

شایانی تێ بینی یه که هه ندی له و لێکولینه وه یانه ی له م دواییه دا ده رباره ی ریزبوونی ده نگه کان له چوار چێوه ی برگه دا کراوه وای پیشان ده دا که له هێشووی سه ره تادا ده رکه وتوویی به ره و زیادبوون ده روات له سه ره تاوه تا ده گاته ناوکی برگه که له لووتکه ی ده رکه وتووینه . هێشوو بزوێنی سه ره تای برگه ی کوردیش ئه م راستی یه زیاتر ده سه لمێنی ، چونکه ته نیا دوو جۆر هیشووه بزوێنی سه ره تا له کوردیدا ده بێ وهه ردووکیان که رتی دووه میان ده بێ نیوه بزوێن بێت ( نیوه بزوێن ده رکه وتوویی له هه موو بزوێنێك زیاتره به پیی نه خشه که ی سه ره وه ) . بـۆ نموونه ، له وشه یه کی وه ك (( گوان )) دا پله ی ده رکه وتوویی له / گ / دا که مه ، له / و / دا زیاتر ده بی تا ده گاته ده نگی / آ / که ناوکی برگه که یه و لوتکه ی ده رکه وتوویه .

## ب - تیۆری نه بز : ( ~~.....~~ نه بێز )

(٢١)

ئه م تیوره باوه ری وایه که نه بزه کانی سی ژماره ی برگـه دیاری ده کـات . به پێ ی ئه م تیۆره برگه بریتی یه له و کۆمه ڵه ده نگه ی که به یه ك ته وژم ( جار ) له سیه وه ده رده چی .

یه کێك له که م وکورتی لێکۆلینه وه ی فونه تیکی برگه به شێـوه یه کی گشتی له وه دایه کـه ناتـوانێ سنووری بـرگه مـان بۆ جیـابکاتـه وه ، به واتـای ئه وه ی که ئه گه ر بمانه وێ به شێوه ی فۆنه تیکی له برگه بکۆڵینه وه ، ئه وا له وانه یه هه ر گیز نه گه ینه یاسایه کی گشتی که سنووری برگه مان له هه موو زمانه کاندا بۆدیاری بکات ، چونکـه نه ك هـه ر زمانـه به جـۆریك سنـووری برگـه دیاری ده کـات وجۆرێکی برگه په سه ند ده کات به سه ر جۆره کانی تردا ، به ڵکو سنووری برگه له شێوازێکه وه بۆ شێوازێکی تری هه مان زمانیش ده گۆرێ . لـه به ر ئـه م که م وکورێیه ی تی روانینی فـۆنه تیـك ده رباره ی بـرگه ، زۆربـه ی زمانـه وانه کـان باوه ریان وایه که ده بێ به شێوه یه کی فۆنمیکی یان وه زیفی ( به پێ ی ئـه رك ) له برگه بکۆلرێته وه . به واتایه کی تر ، بۆ دیارکردن سنوورو پێناسه کردنی برگـه خۆی ده بێ له زمانێکی دیاری کراودا له دیارده که بدوێن .

## ٢ ـ شێوه ی ئه ركی یان فۆنیمیكی :

به پێ ی ئه م بۆ چوونه برگه ئه و كۆمه ڵه ده نگه یه كه فۆنوتاكتیكی زمانه كه سنووری بۆ دیاری ده كات . لێره دا مه به ست له فۆنوتاكتیك ئـه و یاسـایانـه ن كه ریزبوونی ده نگه كان له ناو چوار چێوه ی برگه یه كدا یان وشه یه كـدا دیاری ده كه ن . بۆ نموونه ، یاسایه كی فۆنوتاكتیكی كوردی ئه وه یه كه ئه گه ر ده نگێكی نه بزوێن كه وته نێوان دوو ده نگی بزوێنه وه ، ئه وا نه بزوینه كه له گه ل برگه ی دووه مدا ده روات به واتای ئه وه ی كه ده بێته پارچه ی پێشه وه ی برگه ی دووه م وه ك به م نموونانه دا ده رده كه وی : ئه رۆم ( ئه . رۆم ) ، ناخۆم ( نا . خۆم ) ، ناكه م ( نا . كه م ) ، ئه زانم ( ئه . زا . نم ) . . . هتد . ئه م یاسایه ش به شێكه له یاسایه كی گه وره و بلاوتری فۆنوتاكتیكی كوردی كه ناهێڵێت به شی پشته وه ی برگه ده نگی تێیدا گزره بێت ومه یلی ئه وه ی تێدایه كه زۆربه ی برگه كانی كراوه وسووك بێت .

برگه له سێ به شی سه ره كی پێك دی : پێش ولوتكه و پاش . ئاسایی پێش وپاشی برگه ده نگی نه بزوین پێكی دێنی ، لووتكه ش ده بێ ئاسایی یان نه بزوین بێت یان ده نگی وه ك نه بزوین ره فتاركات . پاش وپێشی برگه له وانه یه نه بێ ، ئه وسا هه ر لوتكه كه به ته نیا برگه كه پێك دێنی . بۆ نموونه ، هـه ردووبرگـه ی وشه ی (( كاروان )) هه رسێ به شه كه ی بركه یان تێدایـه ، به لام بـرگه كـانی وشه ی (( ئێوه )) ، به شی پاشه وه یان نی یه و ( ئی ، وه ) برگه نی یه له كوردیدا به شی پێشه وه و لووتكه ی تێدانه بی . هه روه ها برگه ش نی یه كه لووتكه كه ی ده نگێكی نه بزوین بی . ( وشه یه كی وه ك ( ش ) به واتای (( بێ ده نگ به )) لێره دا به وشه ی زمانی دانه نراوه ) . ژماره ی برگه ی وشه یـه ك وه ك ژماره ی بزوینه كانی وشه كه ن ، به واتایه كی تر ، چه ند بزوێن له وشه یه كدا هه بێ ، له وه نده برگه پێك هاتووه . بۆ نموونه ، وشه یه كی وه ك ( پر ، بشر ، در . . . . . ) له یه ك برگه پێك هاتووه چونكـه یه ك بـزوێنی تێدایـه ووشه ی ( دارا ومـالأن وكاروان ) دوو برگه ین ووشه ی ( جیانابیته وه ) پێنج برگه یی ـ . . . . . . . هتد .

جۆری برگه په یوه ندی زۆره به موسیقای زمانه وه . ئه و زمانانه ی كه برگه ی قورسیان زۆره ، به واتای ئه وه ی پاش وپێشی بـرگه یـان فره كـه رته ، بـه لای

گوێگرێکه وه (( موسیقی )) نین . به پێچه وانه شه وه ، ئه و زمانانه ی برگه کانی به زۆری کراوه ن ( به لوتکه دواییان دی ) یان پاش وپێشسان هێشووه نه بزوێن ن یه ، ∴ لای گوێگره وه زمانێکی موسیقین . زمانی ئینگلیزی له نێوان ئه م دوو جۆره دایه ، چونکه برگه ی کراوه و برگه ی قورسیشی زۆره . کوردی به پێچه وانه وه ، به شی زۆری برگه کانی کراوه ن وبرگه ی قورسیشی ن یه چونکه نه له پاشی ونه له پێشی برگه وه رێگه به هێشووه نه بزوین زۆر که م ده دات . بۆ روون کردنه وه ی ئه م راستی یه واله خواره وه دوو دیره شیعری کوردی هاوچه رخ که رت ده که ین وسه رنجێك له جۆری برگه کانی ده ده ین : ـ

هه . موو رۆ . ژی له . به ر سه یـ . ری بـ . تی ئه و . به ژ . نوو . با . لاّ . یه‌له . سه ر . رێـ . دا . ئه . وه س . تم . من . هه . تا . کو . ئا . وی . پێم . دا . یه .

سه رنجێکی سه ر پێ ی لـه م دوو دێر شیعـره که بـه هه ردووکیـان ( ٣٢ ) برگه یان تێدایه بۆمان ده رده خات ( ١ ) که له م سی ودوو برگه یه ته نیـا ده یان برگه ي داخراون و ( ٢٢ ) یان برگه ی کراوه ن له و جۆره ی که له نه بـزوێنێك وبزوێنێك پێك هاتوون ( ئه و جۆره ی که له هه موو زمانه کانی گێتیدا په سه نده ) (٢ ) له م سی ودوو برگه یه هیچیان برگه ی قورس نین ، به واتای ئه وه ی له پێش وپاشی برگه کانـدا هیشووه ده‌نگی نـه بـزوێن گـزره نـه بـووه ، بـه لّکـو بـرگـه داخراوه کانیش ( وه ك به ر ، من . به ز . . . . . ) کۆتاییان به ده نگێکی نه بزوێن هاتووه نه ك هێشووه ده نگه . برگه ی ( ئه و ) یش له رووی فۆنه تیکه وه نـه ك فۆنۆلۆجی پێشی هه یه ، ئه گینا برگه که هه ر لوتکه که و پاشه که ی دیاره .

زۆربه ی ئه و راستیانه ی که لێکولینه وه کانی ئـه م دواییه ده ربـاره ی رۆنانی ناوه وه ی برگـه ده ری خستوون . لـه برگـه ی کوردیشـدا تێینی ده کرێت وا لـه خواره وه هه ندی له م رستیانه روون ده که ینه وه . ( بێل هوپه ر ، ١٩٧٨ ل ٨ ـ ١١ ) .

١ ـ له چوار چێوه ی وشه دا وه ك دانه یه کی فۆنۆلۆجی که م جار دوو بزوێن ده چنه سه ر یه ك . ئـه م دیارده یـه له شێـوه ی زمانـه کانی گێتی دا وایـه ، هه روه هـا له کوردیشدا رێگه ی نادری .

ی له ١٠ ٪ ـ ١٥ ٪ ی زمانه کانی گێتی رێگه به دوواهاتنی دوو نه بزوین . له کوردیدا ئه م جۆره برگه یه هه یه ودوو نه بزوین ئاسایی ده توانن پاشی لووتکه بگـرن ( وه ك له : ئـه رك ، ئارد ، ئـه شـك . . . . . هتـد ) بـه لام له سه ره تادا نموونه ی وا له کوردیشدا به ده گمه ن ده بینری .

٣ ـ له به شی زۆری زمانه کانی گێتیدا برگه لـه جۆری نـه بزوێنێـك + بزوێنێـك شوێنیکی تایبه تی هه یه ، به واتای ئه وه ی له و جۆره یـه که پـه سه نـده گۆرانی برگه یی به و مه به سته یه ئه م جۆره له زماندا زۆر بێت . دیسانه وه ئـه م جۆره برگه یه له کوردیشدا زۆر بلاوه و په سه نده . زۆربه ی جاریش که سنووری برگه له کوردیدا ده گۆری به ومه به سته یه که برگه ی له م جۆره بێته کایه وه . بۆ نموونه ، بروانه چۆنیه تی که رت کردنی گوتنیکی وه ك (( دزیم . د . زیم ) وبه راوردی بکه لـه گه ل ( دزیمان ودزیمانن ـ د . ز . مان / د . زیـ . ما . نن ) له (( دزیمان )) دا برگه ی دووه می (( دزیم )) ده کرێته وه وله (( دزیمانن )) دا برگه ی سێیه می (( دزیمان )) ده کرێته وه . به م جۆره له سنوری فۆنۆلۆجیدا ، سنووری برگه کـان ده گوری به و مه به سته ی تاله تواناادا بێت برگه ی کراوه زیاتر بێت ) .

٤ ـ له نزیکه ی ٢٠ ٪ ـ ٤٠ ٪ زمانه کانی گێتی دا له رووی فۆنۆلۆجیه وه برگه و وشه ده بێ به نه بزوین ده ست پێ بکات . له رووی فۆنۆلۆجیه وه دیسانـه وه وشه ی کوردی به نـه بزوین ده ست پێ ده کـه ن چونکـه هه مـوو بزوێنـه کانی کـوردی له سه ره تادا ده نگی نه بزوێنی / ی / ( هه فره ) یان لـه گه لـدایه هـه ر وه ك نووسینی کوردی ده ری ده خات . ( بروانه : ئاو ، ئارد ، ئۆخه ی ، ئێمه ، ئه مه . . . . . )

٥ ـ له زمانه کانی گێتی دا هێشووه نه بزوینی پێشه وه بـلاوتره لـه هێشووه بـزوێنی کۆتایی . زمانه کانی جیهان هێشووه نه بزوێنیان له پێشه وه یه به لام ژماره یه کی زۆر که متر هێشووه بزوێنی دواوه یان هه یه . له کوردیدا هێشووه ده نگ له پاشی لووتکه ی برگه وه ده بینری ( بروانه ـ ئارد ـ ئه رك ، گه ، یشت . . . . . هتد ) .

٦ ـ ریزبوونی ده نگ له هێشووه نه بـزویندا بـه پێ ده رکه وتـویی یه وتـا به ره و لووتکه ی برگه بڕوێن ده رکه وتووی له زیاد بووندایه . ئه و هێشووه که مانـه ی له زمانی کوردیدا هه ن ئه م باوه ره ده سه لمێنن وه ك (( گوا . ڕه )) ، (( گیان )) ، گه و . ره . . . . . هتد .

٧ ـ لووتکه مه رج نی یه و هه ر بزوێن پێکی بێنی وله زۆر زماندا ده نگی تریشی ئه ده وره ده بینن وده نگی له رزۆك ( ر ، ڕ ) وبه خشپه و ته نانه ت ده ربازیش به کاره هه ل ده ستن . له کوردیدا برگه نی یه لووتکه که ی بزوین نه بێ ( له رووی فۆنۆلۆجیه وه ) .

٨ ـ نیوه بزوێن ( و ، ی ) له و که رته ده نگیانه یه که زۆر په سه ندن بۆ لکاندن به واتای ئه وه ی له برگه دا ده چنه نێوان دوو نه بزوێنه وه یان نه بزوێنێك ولووتکه ی برگه که . ئه م راستی یه له کوردیدا زۆر ئاشکرایه چونکه / و / و / ی / زۆر جار بۆ شکاندنی هێشوو به کاردێن وله سه ره تاشه وه له و هێشووه که مانه ی که کوردی هه یه تی خۆیان ده بنه که رتی دووه م : گیا ، چیا ، چوار ، . . . . . هتد

برگه دوا دانه ی ئاستی فۆنۆلۆجی نی یه که زمانه وانه کان جیایان کردبێته وه ، به ڵکو به دوای ئه میشدا وله مه یش گه وره تر دانه هه یه له م ئاسته ی زماندا ، به لام شایانی تێ بینی یه که تا به ره و دانه ی فۆنۆلۆجی گه وره تر بڕۆین ناسینه وه ی دانه که گرانتر ده بێت ، چونکه سنووری دانه که کاڵ ده بێه وه ووای لێدی له گه ڵ ئاسته کانی تردا تێکه ڵ ده بێ ودیاری کردنی به نده ده بێ به وانه وه . بێ گوومان تا ناسینه وه ی دانه که ش گرانتر بێ وسنووره که ی کاڵتر بێ ئه وا دانه که که متر که ڵکی لی وه رده گیری . له سه روو برگه وه ، زۆر زمانه وان دانه ی ـ (( ره وه برگه )) ـ ده ناسێنن وجیای ده که نه وه* . مه به ست له ره وه برگه کۆمه ڵه برگه یه که به یه که وه به یه ك ته وژم یان هه ناسه له ده م ده رده چن . به دوای ره وه برگه دا (( رسته ی فۆنۆلۆجی )) ده ناسرێته وه که وه ك هه ندی زمانه وان باوه ریان وایه به (( وه ستاندن )) کۆتایی دێت هه ر چه نده له رسته ی فۆنۆلۆجی به دواوه تائێستا هیچ دانه یه کی فۆنۆلۆجی دانه نراوه ، زۆربه ی زمانه وانه کان

---

* به رای هه ندی کورده وان ( بۆ نموونه د . وریا عومه ر ) له وانه یه ره وه برگه ته فعیله ی دیری شیعری بێ چونکه دێر ده بێ به دوو به یت وهه ر به یتێکیش ده بێ به چه ند ته فعیله یه که وه :

کان ـ یه کی / روو ـ نی ـ به ر / تـ ـ ری ـ فه ی / مان ـ گه ـ شه و /

له ـ بن ـ یا / بـ ـ له ر ـ زی / مر ـ وا ـ ری / زیـ ـ خو ـ چه و /

ئه م رایه ش له دێره وه له لایه ن ( ئه به رکرۆمبر ) یه وه خراوه ته ، وو . هه ر له به ر ئه مه شه (( ره وه برگه )) هه ندی جار به (( Toot )) ناو ده بری .

هه ست به وه ده كه ن كه دانه ی گه وره تریش هه یه ( بۆ نموونه ، په ره گراف كه له رووی رێزمانیه وه دانه یه كه سه ره تاو كۆتایی دیاری ده كـری وتایبـه تی خۆی هه یه . . . . . . ) . یه كێك له و هۆكاره گرنگانه كه نایه لێ دانه ی تر له ئاستی فۆنۆلۆجیدا دیاری بكری ئه وه یه كه هه ر دانه یه ك به دوای برگه دا بێت وله برگه گه وره تر بێت ده بێ په یوه ندی له گه ڵ واتادا هه بێ .

بۆ نموونه ره وه برگه و رسته ی فۆنۆلۆجی هه ردووكیان واتایان هه یه ، چونكه به رامبه ر فریزو رسته ی ئاسایی ده وه ستن . به مه ره فتارییان له ره فتاری دانه ی فۆنۆلۆجی ناچێت چونكه یه كیك له تایبه تیه هه ره گرنگه كانی دانه ی فۆنۆلۆجی وه ك فۆنیم وئه لۆفۆن وسیمای جیاكردنه وه ئه وه یه كه ناسینه وه و جیاكردنه وه و پێناسه كردنیان له سه ر بنه مای واتا نابێت وپه یوه ندی به واتاوه نی یه . دیسانه وه ، ناسینه وه و پێناسه كردنی برگه ش په یوه ندی به واتاوه نی یه . ئه گه ر برگه یه ك واتـای هه بێت ، ( وه ك : (( بـا )) ، (( ره ش )) ، (( دار )) ، (( كـار )) . . . . . . . هتد ) ئه وه له ئه نجامی ئه وه وه یه كه له هه مان كاتدا مۆرفیمیشه . )
Bolinger , 1972 , 66 )

## ٥ ـ مۆرفیم وئه لۆمۆرف :

به دوای داهێنان وناسینه وه ی بیری فۆنیم له كۆتایی سییه كاندا زمانه وانه كان كه وتنه گه ڕان به دوای دانه یه كی رێزمانیدا كه هه مان ده وریان بو ببینی . ئه وه بوو له سه ره تای چله كاندا بیری مۆرفیم هاته كایه وه . به پێ ی ئـه م بیره هـه موو كه ره سه یه كی رێزمانی شی ده كرێته وه بۆ چه ند دانـه یه كی پچـووك كه پێ ی ده وتری (( مۆرفیم )) و ئه لۆمۆرفیش وه ك زاراوه یه ك بو ئه و شێوه جیاجیایانه ی مۆرفیمێك به كاردی كه له چوارچێوه ی تردا ئه ركی مۆرفیم ده بینین . له نووسینی چله كانا مۆرفیم به شێوه یه كی گشتی وه ك خشت یان به رد سه یر ده كری . وه ك چۆن خانوو یان دیوار له به رد دروست ده كری ، وشه و فریزو رسته ش هه ر به م جۆره له لێكدان وریزكردنی مۆرفیمه وه دروست ده بێ . ( د . كریسته ل ل ١٨٨ ) .

مۆرفیم بچووکترین که ره سه ی زمانه که واتای هه بێت . واتای مۆرفمێـك به رامبه ر واتای هه موو مۆرفیمه کانی تری زمانه که ده وه ستێ ، به واتای ئه وه ی له هه موویان جیاوازه . دووخال له م بنه مایه وه هه ڵ ده قوڵێ ( کریسته ل ، ۹۷۱ ، ل ۱۹۳ ) .

١ ـ ئه گه ر مۆرفیمك بۆ گوتنێك زیاد بکرێ یان لابیرێت لێ ی واتای گـوتنه کـه ده گۆرێ . بۆ نموونه ، شاره زایی ، (( شاره زاییـان )) ، (( نه شـاره زایی )) له گه ڵ (( شاره زاو )) دا له واتادا جیاوازن .

٢ ـ ئه گه ر مۆرفیم که رت بکرێ بۆ پارچه ی وردتر ئه وا دانه که ده شێوێ وکه رتێ پێ واتا دروست ده بێ : (( ره سه ن )) ، بۆ نموونه ، که رت ناکرێ بۆ پارچه ی وردتری ئه وه ی بشێوی وکه رتی بێ واتامان بداتێ :

ره ، سه ن . . . . . شی کردنه وه و که رت کردنی مۆرفیم راسته وخۆ ده مـانباتـه رۆنانی فۆنۆلۆجی زمانه وه .

دانه ی مۆرفیم له چه ند روانگه یه که وه تێ ی ده روانرێ سیپانیان ته واو بلاٌون ، ( کریسته ل ۱۹۷۱ ، ل ، ۱۹٤ ) .

أ ـ مورفیم دانه یه کی فیزیکی یه ، به واتای ئه وه ی شێوه یه کی فۆنه تیکی هه یه یان فۆرمه وبوونێکی مادی هه یه .

ب ـ مۆرفیم واتای هه یه . به مه له فۆنیم وهه موو دانه کانی تری ئاستی فۆنۆلۆجی جیا ده بێته وه .

جـ ـ مۆرفیم ده ورێکی سینتاکسی هه یه که له رۆنانی رێزمانی گه وره تر له شـوێندا ده ینوینێ ـ به واتای ئه وه ی له وشه و فریزو رسته دا دووپات ده بێته وه وئه مـانه دروست ده کات .

ناسینه وه ودیاری کردنی مۆرفیم وئه لۆمۆرف کارێکی گران نی یه وله زۆر باردا به پێ گیرو گرفت بیره که جێ به جێ ده بێ . بۆ نموونه ، له رسته یه کی وه ك : (( دوێنێ هـه ردووکمان چـووین بۆ شـار )) به ئـاسانی ده تـوانین هـه شت مـۆرفیم له یه کتری جیابکه ینه وه : دوێنێ ، هه ر ، دوو مان ، چـوو ، ین ، ه ، شار . . . . . . . دیسانه وه ، به ئاسانی هه ست به وه ده که ین که مۆرفیمی ( ه که ) ی ناسیاری زیاتر له شێوه یه کی ( ئه لۆمۆرفیکی ) هه یه ، چونکه له هه ندی شوێندا

ده بێ به ( یه كه ) یان ( ـ ۆكه ) یان ( ـ ئێكه ) یان ( ـ كه ) یان ( ـ ئه ك ) وه ك له م
نموونانه ی خواره وه دا ده رده كه وی :

ـ ه كه : پیاوه كه ، ژنه كه / ه / : داپیره

ـ یه كه : چرایه كه ( زاری هه ولیر )

ـ ۆكه : خانۆكه ( زاری سلیمانی )

ـ ئێكه : قاپێكه ( زاری سلیمانی )

ـ كه : چراكه ، براكه ( زاری سلیمانی )

توره كه كه ، ماڵه كه

ـ گه : ماڵه كان ، چراكان

ـ ئه ك : پیاوه كان ، ژنه كان

له به ر ئه وه ی ئه م هه موو شێوانه له رووی فۆنه تیكه وه لـه یه كـتر ده چن وهه مووشیان هه مان ئه رك ده بینن وشێـوه كانیشیـان به پی ی یـاسا گـۆراون ، ده تـوانـین بـه هـه مـوو ئـه مـانـه بلێـین ئـه لـۆمـورف / ه كـه / ی ئـه وه ی له بنه ماسه ركیه كانی تیوری مۆرفیمی لا بده ین .

یه كێك له كه م وكورتیه كانی بیری مۆرفیم له وه دایه كه هه موو كـاتی وابه م ئاسانی یه كارمان بۆ راناپه رێنی وزۆرگیروگرفتی وا دێته ریگه كه زمانه وانه كان ناچار ده كات له بنه ما بنه ره تیه كانی مۆرفیم ده رچن تاوه كو دیارده كه لێك بده نه وه ، به واتایه كی تر ، به زۆر راستی یه كانیان كردووه به ناو تیوری مۆرفیمدا وبه مه ش تیۆره كه یان شێواندووه . ( كریسته ل ١٩٧ ) بۆ نمـوونه ، مـۆرفیمی كۆلـه كوردیدا پیك هاتووه له ( ه آن ) یان ( ـ یان ) . له هه ندی فۆرمیشدا ( ـ آت ) یان ( ـ هات ) یان ( ـ جات ) هه مان ئه رك ده بینی . جگه له مه ش له گه ڵ هه نـدی وشه دا مۆرفیمی ( ـ گـه ل ) دیسانـه وه ناوكـۆده كاتـه وه وه ك به م نمـوونانـه ی خواره وه دا بۆمان ده رده كه وی :

١ ـ ( ـ آن ) : پیاوان ، ژنان

٢ ـ ( ـ یان ) : ( ئه و برایانه ، چرایانه

٣ ـ ( جات و ـ آت وهات ) : میوه هات ومیوه جات

گه ل : كورگه ل

ئایا هه موو ئه م شێوانه ی سه ره وه ده توانرێ به ئه لۆفۆرمی مۆرفیمی ( ـ ان ) ، دابنرێ ؟ هه ندێ زمانه وان هه ریه که م ودووه م به ئه لۆمۆرف داده نێ وچونکه یه ك ئه ركیان هه یه وله رووی فۆنه نیکه وه له یه ك ده چن و گۆڕانی ( ـ ان ) بۆ ( یان ) به هۆی یاسایه کی فۆنه لۆجیه وه لێك ده دریته وه . هـه ندێکی تـرکۆمـه ڵه ی یه که م ودووه م وسیه میش به یه که وه ده به ستن وهه مووی‌ان ئه لۆفۆرمی ( ـ ان ) داده نێ هه رله به ر ئه و هـۆیانـه ی سه ره وه . هـه ر چه نـد گۆڕانی فـۆنه تیکی کۆمه ڵه ی سێیه م وابه ئاسانی لێك نادرێته وه ، به لام تاراده یه ك باوه ره که رێ ی تێ ده چی چونکه هه موو ئه م ئه لۆفورمانه له شێوه دا له یه کتری ده چن . هه ندی زمـانه وانی تـریش سوورن لـه سه ر ئـه وه ی که کـۆمه ڵـه ی چواره میش هـه ر ئه لۆمۆرفی ( ـ ان ) ە چونکه ئه میش وه ك ئه وانه ی پێشووتر هه مان ئه رك ده بینی و ( ناو کۆده کاته وه ) له رۆنانی رێزمانی گه وره تردا ( رسته وفریز ) ده ور ده گێری .

په سه ندکردنی ئه م رایه ی دوایی هه موو بنه ما سه ره کیه کانی مۆرفیم تێك ده دات چونکه ئه گه ر گۆی نه ده ینه شێوه ی فۆنه تیکی ئه وا ده بێ ده رگا بخه ینه سه ر پشت وده یان بیری ناپه سه ند رێگـه بده ین ، بـۆ نموونـه ، ئه وسـا هه مـوو وشه یه کی هاوواتا ( وه ك دارستان ولێر ) هه موو رسته یه کی هاوواتا ( وه ك : ناڕۆم وناچم ) ده بنه ئه لۆمۆرف بۆ یه کتری . له لایه کی تریشه وه دانانی ( ـ گه ل ) به ئه لۆمۆرفی ـ ان ) کێشه یه کی ترمان بۆ په یدا ده کـات چونکـه ده مانخـاته دوو هه ڵوێستی دژ به یه کتریه وه : له لایه که وه ئه وشه له مۆرفیم پێك دێنین وله لایه کی تریشه وه ئه لۆمۆرفیکمان دۆزیوه ته وه وشه یه .

که م وکورتی بیری مۆرفیم له وه شدا ناوه ستی وهه ندی جار تووشی هه ڵوێستی زۆر له مه ناله بارترمان ده کات ، وا له خواره وه دوو نموونه ی تـر لـه سـه ر ئه م گیروگرفتانه ده ده ین بۆ روون کردنه وه : ـ

( ۱ ) هه موو کوردی زانێ هه ست به وه ده کات که مۆرفیمێکی وه ك (( نوێ )) چه ند شێوه یه کی جیاواز وه رده گرێ له وشه ی لێکدراودا وه ك به م نموونانه ی خواره وه دا ده رده که وێ : ( ۱ ) ( نه ـ له نه وزاد دا ( ۲ ) ( نۆ ـ ) له نۆماڵ و نۆ بووك دا ( ۳ ) ( نوی ـ ) له خواز دا . ئه گه ر پێ داگرین له سه ر ئه وه ی که ئه لۆمۆرفی فۆنیمێك ده بێ له رواڵه تدا ( له رووی فۆنه تیکیه وه ) له یه کتر بچن ئه وا

هه روا به ئاسانى ناتوانين ئه مانه به ئه لۆمۆرفى فۆنمێك دابنين چونكه نه ك هه ر ته نيا گۆرانێكى فۆنه تيكى زۆريان تێدا ده بينرێ، به ڵكو گۆرانه كه ش به هۆى ياساوه دابين ناكرى . بێ گومان ئه گه ر هه رسووريش بين له سه ر بنه ماى واتاو ئه ركى رێزمانى ، ده بێ هه رسێكيان به ئه لۆمۆرف دابنێين ، چونكه يه ك واتايان هه يه و له رۆنانى رێزمانيشدا ده ورده بينن . ته نانه ت په سه ند كه رانى رێبازى دووه م ده شتوانن بڵێين كه ئه م جۆره ئه لۆمۆرفانه له و جۆرانه ن كه به ياساى مۆرفۆلۆجى زمانه كه وه به ندن و گۆرانه كه به هۆى ياساى كاتييه وه ( ad hoc rules ) دابين ده كرێ : ـ




راستى ى ئه م دووه ه ڵويسته دژ به يه كترييه له يه ك كاتدا نيشانه ى ئه وه يه كه بيرى مۆرفيم كه
ڵكێكى كه مى هه يه و هه موو زمانێك ناتوانى سوودى لى وه رگرێ .

( ٢ ) لێكدانه وه ى هه ندى فۆرمى وه ك رۆشت له رسته ى ئه و رۆشت وبه راورد كردنى له گه ڵ رسته يه كى وه ك ئه وان رۆشتن ئه و راستيه مان بۆ ده رده خات كه رۆشت له دوو مۆرفيم پێك هاتووه : ـ ره گى كردار : رۆشت
نيشانه ى كه سى سيه م : Ø ( سفر )

كه واته مۆرفيمى نيشانه ى كه سى ( له گه ڵ كردارى رابردووى تێنه په ردا ) پێك هاتووه له چه ند ئه لۆمورفى ( م ، ت ، ن ، بين ، Ø ) كه يه كێكيان له شێوه ى سفردايه ، ئه مه ش له گه ڵ ئه و بنه مايه دا ناگونجى كه ده بى مۆرفيم بوونێكى هه بێ چونكه سفر بوونى فيزيكى نى يه . كه واته جارێكى تر بيرى مۆرفيم دووچارى كێشه ده بى له م جۆره دياردانه دا .

ئـه م نمونـانه ئـه و راستیه مـان بۆ دوورپـات ده كه نـه وه كه زمـانه وانـه كان له چله كاندا له گه رمه ی دۆزینه وه نوی یه كانیاندا گۆییان به هه نـدی كێشه ی تیۆری بیری مۆرفیم نه داوه و بیری مۆرفیمیان به ئاره زووی خۆیـان به م لاولادا راكێشاوه . وبه سه ر هه موو دیارده كاندا جی به جی یان كردووه بێ ئه وه ی گوی بده نه ئه و بنه ماو سنووره ی خۆیان بۆمۆرفیمیان كێشاوه . ونه بێ ئه م كێشانه ی كه له سه ره وه لێیان دواین شتێكی نوێ بێ یان له م دواییه دا هه ستیان پێ كرابێ به ڵكو به پێچه وانه وه هه رله گه رمه ی سه رهه ڵدانی مورفیمه وه په نجه یـان بۆ راكێشراوه ، به ڵام ئه م كێشانه نه بوونه هۆی پێداچوونه وه ی بیره كه نـه وازلێ هێنانی . ئه وه ی ئاشكرایه ئێسته ئه وه یه كه بیره كه كه ڵكێكی كه می لێ ده بینری وبه زۆری بۆ هه ندی زمان ده ست ده دا ، ( كریسته ل ل . ١٩٨٠ ) وه ك زمانه لكاوه كان كه تێیاندا مۆرفیم له دوای مورفیم به یه كتره وه ده نووسێن بێ ئه وه ی شێوه ی فۆنه تیكیان تێك بچێ یان گورانی به سه ردا بێت .

شایانی تێ بینی یه كه هاتنه كایه ی ئه لۆمۆرف ده گه رێته وه بۆ سی هۆكار : ( ١ ) كاری ده نگی دراوسێ وه ك ئه و گورانانه ی به سه ر مۆرفیمی ( ـ ه كه ) و ( ـ ـ ان ) دا هاتووه ( ٢ ) شێوازی قسه كردن وه ك ئه و گۆرانه ی به سه ر مۆرفیمی (ـ ه كه ) ی نیشانه ی ناسیندا دێ . وله چیرۆك گێرانه وه دا ( پیاو خۆی كرد به لای ته ویله داو ئه سپه شێ یه ی هێنایه ده رێ ) ئه لومورفی ( ه ) ده چێته شوێنی (ـ ه كه ) . ( ٣ ) زاره كانی زمان ، بۆنموونه ، گورانی ئه لۆمۆرفی ( ه كه ) به ( ۆكه ) و ( ئێكه ) له وشه ی ( قاپیه كه وخانوكه ، جوانۆكه ) به پێ ی زاره كانی كوردییه .

زمانه وانه كان زۆر چـه شن مۆرفمیـان له یكتـری جیاكـردۆته وه به ڵام لـه هه موویـان گرنگـتر جیاكـردنه وه ی مـۆرفیمی به نـدو ئازاده . مـۆرفیمی به نـد به ومۆرفیمانه ده وتری كه سه ربه خۆ به كارنایه ن له زمانه كه دا وده بێ له گـه ڵ كه ره سه ی تردا بن وه ك هه موو پێشگرو پاشگرو ناوگرێك : ه كه ، ئـ ان ، ه ، بـ ، ـ ئایه ( داره كه ، داره كان ) ، وه ره ، بروابڕێشتایه . . . هتد ) مۆرفیمی ئازاد ، به پێچه وانه وه ده توانێ سه ربه خۆ به بێ یاریده ی كه ره سه ی تر له زمانه كـه دا به كار بێت وه ك : با ، دار ، جێگا ، ده ست .

کێشه یه کی تر له تیوری مۆرفیمدا ئه وه یه تا چی راده یه ك ده توانین له که رت کردنی وشه دا به ره و دواوه برۆین وبچینه ناو مێژ ووی زمانه که وه . بۆ نموونه ، وشه یه کی وه‌ك ( نایاب ) له دوو مۆرفیم پێك هاتووه وکه رت ده کری بۆ ( نا ـ یاب ) یان چاکترواپه هه ربه یه ك وشه دابنری ؟ به لای ئێمه وه چاکتر وایه له م باره یه وه ته نیا دۆخی ئێسته زمانه که لێك بده ینه وه ونه چینه ناو مێژ ووه وه چونکه قسه که رانی ئیمرۆی زمان ئاسایی ئاگاداری مێژ ووی زمان نین وپێویستیان به مه نابێ . ( سوسیر ، ۱۹۵۹ ل . ۱۸۳ ) .

## ٦ ـ وشه ی لێکدراو ده سته : ـ

هه رچه نده وشه دانه یه کی زمانی یه کجار دێرین و بـلاو وئاشنـایه تـا ئێستا پێناسه یه کی وردو قوڵ وته واوی نه خراوه ته روو . زانایه کی وه ك مالینۆفسکی وشه به دانه یه کی خه یالی داده نی وباوه ری به وه نی یه که بوونێکی له زماندا هه بێ ( Swaminathan , 29 ۰۲۱۱ ) له شێوازی قسه کردنیشد: وشه له دوای وشه به دوای یه کتریدا دێن وهیچ شتێکی نێوانیان سنووری وشه مان بۆ دیاری ناکات . سه ر زاری له شێوازی نووسین دا پێناسه ی ڕناسینه وه‌ی وشه کارێکی گران نی یه ( وشه نووسین بریتیه له و کۆمه ڵه پیته ی که به جیا ده نوسرێن ، به لام لێـره شدا گیروگرفت هه ر دێته کایه وه . وشه یه کی وه ك ( و ) له کوردیدا له گه ل وشه ی پێش خۆیدا ده نووسرێ له گه ل ئه وه شدا که وشه یه وه ده بێ به جیا بنووسرێت . ( Hall , 424۰۲۱) .

یه کێك له پێناسه ی بلاوه کانی وشه ئه وه یه که وشه بریتیه له چه ند مۆرفمێك که جێ گۆری ناکه ن ۰( Hall , 1958 , 133 ) که ڵکی ئه م پێناسه یه له وه دایه که جیاوازییه کی گرنگ له نێوان رسته و وشه دا ده خاته روو . ئه و که ره سانه ی که وشه پێك دێنن توندتـر به یـه که وه وبـه دوای یه کـتریدا گـرێ دراون وه‌ك له و که ره سانه ی که رستـه دروست ده که ن . بـۆ نموونـه ، وشه یـه کی وه ك (نه شاره زاییانه ) له چه ند مۆرفیمێ ( نه + شاره زا + ییانه ) پێك هاتووه که به جۆرێك به دوای یه کتریدا ریزبوون . هه ر گۆرانێك له م رێزبوونه دا بکه ین ، دانـه که ده شێوێنین . به پێچه وانه ی ئه مه وه ، پاش وپێش خستنی کـه ره سه ی رستـه شتێکی ئاساییه ورسته تێك نادات ، بۆ نموونه ئه م رستانه ی خواره وه یه ك واتایان هه یه :

دوینی پیکه وه سه رمان له باوکی دا
پێکه وه دوێنی سه رمان له باوکی دا

له لایه نێکی تریشه وه که ره سه ی وشه تونـد تر گـریٚ دراون به یـه کتره وه وناترازێن وه ك که ره سه ی رسته . یاسـای سینتاکسی مه ودای لادان وده رچوونی زۆره و هه ر ئه مه شه که واله رستهٔ ده کات هه میشه نویٚ و ره سه ن بیٚ وواله گویٚگر ده کات هه ست به وه بکات هـه موو جـاری به رامبـه ر داهێنانێکی نـویٚ خۆی ده بینێته وه . هه رچه نده رسته سه یرو نامۆ وناپه سه ند بێت له رووی ڕیزمانه وه یان واتاوه گویٚگر هه ر ده توانی لێکی بداته وه وچوارچێوه ی وای بۆ بێنێته کایه وه که واتایه ك بدات به ده سته وه . بۆ نموونه ته نانه ت رسته یه کی وه ك (( هێنده تاریك نه بوو تاببینم )) ( Swaminathan , 39 ) که سه رزاری نامۆو سه یره وله گه ڵ راستیدا ناروات ، له چوارچێوه یه کی وه ك :
نه متوانی بزانم ڤینوس له سه روو ئاسۆوه دیاربوو یان نا ، هێنده تاریك نه بوو تا ببینم . . . . واتا په یدا ده کات وده بێته رسته یه کی ئاسایی . بیٚ گوومان ئه م جۆره لادان وده رچوونه له گه ڵ وشه دا ناکریٚ وشه به رگه ی یاریی پیٚ کردن و به ئاره زوو هه ڵ سووراندن ناگری وهه ر له به ر ئه مه شه که ڕیٚگه زۆر نادات به که ره سه کانی جی گوری بکه نٚ - ( فرین و رفین ویه کجاری له ژماره یه کی زۆر که م وشه دا ڕیٚگه ی پی ده دری ) .
به رای هه ندیٚ زمانه وان وشه بچووکترین دانه ی زمانه که توانای جیابوونه وه ی تێدابێت ( Pei , 295 , 1966 ) . ئه م توانایه ی وشه له نووسینی زۆر زماندا ره نگی داوه ته وه به وه دا بـۆشاییـه کی بچووك لـه نێوان سنـووری دوو وشه دا بـه جیٚ ده هێلری . به لاّم ئه م بۆشایی دانانه ته نیا خۆوه وهه نـدیٚ جاریش پـه یره وی ناکریٚ . جگه له مـه ش له هـه ندی دۆخـدا دوودڵیه کی زۆر لـه بابـه ته کـه دا په یداده بیٚ وکه س ناتوانی بزانیٚ جیاکردنه وه یان جیانه کردنه وه په سه نده . له به ر ئه وه پێویستمان به وه ده بیٚ ڕیٚگه بدۆزینه وه بۆ تاقیکردنه وه ی ئه م تایبه تیه ی وشه . واله خواره وه له سیٚیان له م ڕیٚگانه ده دوێن :
أ - سنوری رسته
ئه و فۆرمه زمانییه ی که ده توانێت له سه ره تا یان کۆتایی رسته دا بێت ده بیٚ بـ

وشه دابنرێت ، بۆ نموونه ، ئه م ئه زموونه بۆمان ده رده خات که ( کوره که ) له م دوو رسته یه ی خواره وه دا وشه یه :

١ ـ کوره که که پره که ی رووخاند .

٢ ـ کتێبه که م دا به کوره که .

بێ گومان به پێ ی ئه م یاسایه بێت ، زۆر به شی ئاخاوتنی کوردی نابێ به وشه دابنرێت وه ك ـ ئامرازی په یوه ندی وئامرازی په یوه ست چونکه زۆری ئه مانه نه ك هه ر له پێشه وه به ڵکو له دوای رسته شه وه نایه ن وه ك له م رستانه ی خواره وه دا ده رده که وی :

له‌کوێ به یه کتر گه یشتن ؟

* به یه کتر گه یشتن کۆی له ؟

* کوره که هات و . . .

* وکوره که هات

ب ـ جی گۆرکی :

ئه و فۆرمه زمانینه ی له سنورێکدا ده جووڵێ وجێ گۆرکی ده کات و شوێنی خۆی ده گورێ بێ ئه وه ی رسته که تێك بدات یان بیشێوێنێ‌ده بێ به وشه دابنرێ .

به م رێگه یه ش ناتوانین پیشانی بده ین که ئامرازی په یوه ندی وئامرازی په یوه ست وشه ن له کوردیدا چونکه به ته نیا خۆیان جێگه ناگورنه وه :

منداڵه که له ماڵه وه که وتووه .

له ماڵه وه منداڵه که که وتووه .

* له منداڵه که ماڵه وه که وتووه .

هات ودانه نیشت

* وهات ودانه نیشت

جـ ـ تێ ئاخنین :

ئه گه ر دوو فۆرمی زمانی ووشه بن ده بێ بتوانن فۆرمی زمانی تر بخه نه نێوان خۆیانه وه بێ ئه وه ی واتای رسته بشێوێ یان رسته که تێك بچێت . به پێ ی ئه م بنه مایه به ئاسانی ده سه لمێت که ( ئاوه ڵکار ) . . . . هتد وشه ن .

پیاوه که هات .

پیاوه پیره که هات
پیاوه که به دار هات .
به لاّم دیسانه وه ئه م بنه مایه ش ناتوانیّ بیسه لمیّنی که ئامرازی په یوه ندی له کوردیدا وشه ن چونکه که ره سه یه کی زمانی له که ره سه ی دوای خوّیان جیا ناکاته وه .
له ترساندا مرد .
● له زوّر ترساندا مرد .
به لاّم ئامرازی په یوه ست له م ئه زموونه ده دات .
هات ونه مایه وه .
هات زوّر نه مایه وه .

هات به لاّم دانه نیشت
هات به لاّم لامان دانه نیشت .
بیّ گومان ده رچوون له یه کیّك له م ئه زموونانه دا به سه بوّ ئه وه ی فوّرمیّکی زمانی به وشه دابنری . به م پیّیه ش بیّ ، کیّشه مان تووش نابی لـه ناسینـه وه ی وجیاکردنه وه ی وشه دا چونکه ته نانه ت ئامرازی په یوه ندیش لـه یه کیّـك له م ئه زموونانه دا ده رده چن ، ئه وه ته له سه ره تای رسته وه له کوردیدا به کاردیّن :
له که یه وه لیّره یت ؟
بوّ کوّی ده چن ؟
هـه موو ئـه م ئه زمـوونانـه شتیّکمان بـوّ ده سه لمیّنن ئـه ویش ئه وه یـه که ئـه و که ره سانه ی وشه پیّك دیّنن ته واو لکاون به یه کتریدا به جوّریّکی وا چوونه ته ناو یکترییه وه که ریّگه ناده ن فوّرمی تر نیّوانیان بگری ، به پیّچه وانه شه وه ، وشه به ئاسانی له دراوسیه کانی جیا ده بیّته وه . به لاّم ده بیّ بزانین که ئه م لکاندنـه ش وه ها نیه و ده توانین نموونه ی دژ بینینه وه بوّ ئه وه ی بیسه لمیّـنین که تـه نانـه ت که ره سه ی وشه ش له یه کتری جیا ده بنه وه . بوّ نموونه( کوره که ( به پی هه رسیّ ئه زمونه که ی سـه ره وه ده بیّ پله ی ( وشه ی ) بـدریّتیّ وه ك به م نمـوونانـه دا ده رده که ویّ :
کوره که کتیّبه کانی برد . ( ئه زموونی یه ك أ )

کتێبه که م دا به کوره که . ( ئه زموونی یه ك ب )
کتێبه که م به کوره که دا . ( ئه زموونی ۲ )
کتێبه که م به زۆر دا به کوره که . ( ئه زموونی ۳ )
له گه ڵ ئه وه شدا که ئه و که ره سانه ی که ( کوره که ) پێك دێنن و ( کور ) و (ه که ) زۆر لکاون به یه کتریه وه ، ناوێك یان ئاوه ڵناوێك به ئاسانی جیایان ده کاته وه و به (ه‌ڵه ) بۆمان ده سه لمێنی ( به پی ی ئه زموونی ۳ ) که ( ـ ه که ) ش وشه یه :
کوره گه وره که کتێبه کانی برد .
کوره مناڵه که کتێبه کانی برد .
شایانی تێ بینی یه که ئه و پێناسه یه ی سه ره وه هه رچه نده پێناسه یه کی زۆر ورد نی یه وبه کا ڵکی هه ندی زمان نایه ت هێشتا له پێناسه که ی بلوم فیلد باشتره که زمان داده نێ به ( بچووکترین فورمی ئازاد ) چونکه ئاشکرایه که ئامرازی په یوه ندی وپه یوه ست له زۆربه ی زمانه کانی گێتی دا به سه ربه خۆبه کارنایه ن . ئه م که م و کورتیه ش دیسانه وه له و پێناسانه شدا به دی ده کرێ که وشه به بچووکترین دانه ی زمان داده نێت که بتوانی به ته نیا ئه رکی گوتنی ( رسته یه ك ) ببینی ، چونکه ( به ) (له ) ( و ) ( و ) . . . . ناتوانن په ته نیا ئه م ئه رکه بگرنه ئه ستۆ .
هه موو ئه و کێشانه ی پێناسه کردنی وشه ئه و باوه ره ی زمانه وانی رووسی ( شێربا ) ده چه سپێنی که پێناسه ی وشه ده بێ له زمانێکه وه بۆ زمانێکی تر بگۆری ، به واتای ئه وه ی وشه له و دیارده زمانیانه نی یه که له هه موو زمانێکدا یه ك جۆره ره فتار بکات ووشه وه ك دیارده یه کی جیهانی بوونی نی یه .
ته نانه ت له تاکه زمانێکیشدا ، ئاشکراو به لگه نه ویسته که دووجۆره وشه له یه کتری جیا ده بێته وه وپێناسه یان هه رگیز وه ك یه کتر نابێ : ـ ( ۱ ) وشه ی ئه رکی که زیاتر ئه رکی هه یه وه ك واتا ( وه ك ئامرازی په یوه ندی وپه یوه ست ) نه ك هه ر واتای ته واوی نی یه ، به ڵکو هه ندی جار سه ربه خۆیی فۆنه تیکی ومۆرفۆلۆجیش له ده ست ده دات ( بروانه ئامرازی په یوه ستی ) ( و ) له کوردیدا که زۆر جار له شێوه ی پاشگردا خۆی به وشه که ی پێشه وه هه ڵ ده واسی ونه ك هه ر واتای نی یه به ڵکو به پێچه وانه ی هه موو وشه یه کی تریشه وه هێزی هه رگیز ناکه وێته سه ر . ( ۲ ) وشه ی ته واو که به پێچه وانه ی وشه ی ئه رکیه وه هه میشه

فۆرمی فۆنه تیکی ومۆرفۆلۆجی خۆی هه یه و هێزێکی له سه ره و هه رگیز خوی هه ڵناواسی به وشه ی تره وه . بێ گومان له به ر ئه وه ی ئه م دوو جۆره وشه یه زۆر لـه یه کتـری جیاوازن ودیـارده که ش جیهـانی یه ، یـان له زۆربـه ی زمـانـه سروشتیه کاندا به دی ده کرێ ، ده بێ پێناسه یان وه ك یه ك نه بێ یان هه مـان پێناسه به که ڵکی هه ردووکیان نه یه ت .

دیسانه وه ئه بێ ئه و راستیه له یاد نه که ین که زاراوه ی وشه هه موو کاتێ به یه ك واتایه کار نایه ت وزمانه وانه کانی نه ك هه ر له سه ر پێناسه ی رێـك ناکـه ون ، بـه ڵکو هـه ر جاره ش بـۆ مه بـه ستی به کـاریان هێنـاوه . لێـره دا چـوار جـۆر به کا رهێنان به رچاو ده که وێ : وشه ی فۆنۆلۆجی ووشه ی رێـزمانی ووشـه ی رێنووسی ووشه ی واتایی . ( Hall , 134 ) .

وشه ی رێنووسی ئه و شێوه یه ی وشه یه که له نووسیندا ده رده که وێ وشه ی فۆلۆجیش شێوه ی خوێندنه وه یان گۆکردنی وشه مان پیشان ده دات لـه زمانێکی وه ك کوردیدا زۆر جار هه ردووشێوه که وه ك یه کن وجیانابنه وه هه رچه نـده له هه ندی وشه دا هه ردوو جۆره که به ئاشکرا هه ستی پێ ده کری بروانه ئه م نموونان :

| ووشه ی رێنووسی | وشه ی فۆنۆلۆجی |
|---|---|
| به شدار | / به ژدار / |
| بشتده ر | / بژده ر / |
| که س نه ما | / که ز نه ما / |
| بچکۆله | / پچکۆله / |

دیسانه وه به پێ ی ئه رکی رێزمانی ( دۆخ وباری ناوو تافه کانی کار . . . . ) وشه شێوه ی خۆی ده گورێ . ئه م شێوه جیاوازانه ی وشه وشه ی رێزمانی جیاجیان بۆ نموونه ( خوارد . . . . ) ( و ) ( خۆ ) که له چاوگی خواردنه وه وه رده گیرین . بێ گومان هه ندی جار فۆرمه که خۆی گۆرانی به سه ردا نایه ت ، به ڵام دۆخه کـه ده ری ده خات که وشه که ئه رکی رێزمانی جیاواز ده بینی بۆ نموونه ( توند ) له م دوو رسته یدا بریتی یه له دوو وشه ی رێزمانی جیا جیا :

( ١ ) ره شه بایه کی توند ( ئاوه لناو ) که پره که ی روخاند .
( ٢ ) ده رگاکه توند دابخه . ( ئاوه لکار )
وشه ی واتایی بچووکترین دانه ی بیره که به هۆی ده نگه وه ده ر ببری . دیسان ئه و پیناسانه ی که وشه به بچووکترین دانه ی داده نێن که بتوانێ ئه رکی رسته یان گوتن ببینێت هه ر ئه م جۆره وشه یه ده گرنه وه .
شایانی تێ بینی یه که ئه و دانه یه ی له رووی رێنووس و فۆنۆلۆجیه وه به وشه داده نرێ مه رج نی یه له رووی واتاوه پێك بێنی . به واتایه کی تر ، وشه ی رێنووس هه موو کاتی وشه ی واتای نی یه . بۆ نموونه ، هه رچه نده ( له ) له کوردیدا له رووی رێنووس و فۆنولۆجیه وه وشه یه ، له رووی واتاوه به وشه دانانرێ چونکه به ته نیا ئه رکی گوتن نابینی . بۆ نموونه ( له ) به ته نیا ناتوانی وه لامی پرسیارێکی وه ك : له کوی ده ژی ؟ ) بداته وه ، هه ر ده بێ ناوێکی له گه لدا بێ وه ك : له سلیمانی ، له هه نده ران ، له به غا . . . هتد .
بۆ نه هێشتنی ئه و ته م ومژه ی که زۆر جار به وشه وه ده نووسێ هه ندی زمانه وانه وان په نا ده به نه به ر داتاشینی زاراوه ی تر . له و زاراوانه ی که زۆر جار له جیاتی وشه یان جۆرێکی وشه له زانستی زماندا له م سالانه دا بره وی په یدا کردووه ئه مانه ی خواره وه ن :
١ ـ لێکسیم : ئاسایی ئه م زاراوه بۆ وشه و شێوه رێزمانیه کانی به کاردێ ، بۆ نموونه ، له کوردیدا لیکسیمی ( رۆشتن ) ره گی رابردوو ( رۆشت . . . ) و ره گی رانه بردوو ( رۆ . . . ) ده گه رێته وه . به م جۆره له کاردا چاوگی کوردی لێکسیمه وره گه کانیش ئه و وشانه ن که له ناو لێکسیمه که دان .
٢ ـ فۆنیم : ئه م زاراوه یه سوودێکی وای لی نابینری چونکه زۆر جار هه ر به واتای مۆرفیم دی وبچووکترین فۆرم ده گه رێته وه که شێوه و ناوه رۆکی هه بێت ناوه رۆك نه ك هه ر واتا به لکو ئه رکی رێزمانیش ده گه رێته وه ) . بۆ نموونه ، وشه یه کی وه ك ( ده رۆم ) له سی فۆنیم پێك دی : ( ده / رۆ / م ) . هه ندی جاریش فۆنیم هه ر به واتای وشه به کاردێت .
٣ ـ سێمیم وسێمانتیم : ـ سێمیم دانه یه کی سه ره کی ناوه رۆکه و سیمانتیم کۆمه له یه که له سێمیم به واتایه کی تر ، ژماره یه ك سێمیم که تایبه تیه کی واتایی کۆیان کاته وه سیمانتمێك پێك دێنن . بۆ نموونه ، سێمیس ( : ـ ) به ربوونه وه [1] و

= ( که وتنه خواره وه ) ویه ریـونه وه ۲ = بـه ره لاّ کردن و بـه ربونـه وه ی ۳ = داخوریان به هه موویان نیمهاتیمیك پیّك دیّنن چونکه واتا سه ره کیکه له هه موویاندا هه ر ماوه ته وه وهه ستی پیّ ده کریّ .

له ئاستی مۆرفۆلۆجی جگه له مۆرفیم ووشه دانه ی گه وره تریش هه یه که به هۆی لیّکدانی دوو ووشه یان ووشه و گیره که وه دیّته کایه وه . ووشه ی لیّکدراو به هۆی دانه پالّی دوو ووشه ی سه ربه خۆوه دیّته کایه وه و ئه م جۆره لیّکدانه له هه موو زمانه کانی گیّتی دا بلاّوه . ئاسایی دوو جۆر ووشه ی لیّکدراو جیا ده کریّته وه :

( ۱ ) ووشه ی لیّکدراوی سینتاکتیکی که به پی ی ده ستووری ( سینتاکسی ) زمانه که که رته کانی ریّز ده بن و ( ۲ ) ووشه ی لیّکدراوی ناسینتاکتیکی که به پیّچه وانه ی ده ستووری زمانه که وه که رته کانی ده دریّته پالّ یه ك : ـ

أ ـ ووشه ی لیّکدراوی ناسینتاکتیکی : ـ

به زۆری ئه م جۆره له کوردیدا له ئاوه لْناویّك وناویّك پیّك دیّ وبزویّنی / ه / ده یان به ستی به یه کتریه وه : گیله پیاو ، ته ره پیاز ، بۆره زه لاّم ، ره شه با ، که له شیّر .

ب ـ ووشه ی لیّکدراوی سینتاکتیکی : ـ

له م جۆره لیّکدراوه دا که رته کان ئاسایی ریّز ده بن وه ك : دلّ ته نگ ( دلّی ته نگه ) ، سه رسپی ( سه ری سپی یه ) ، دلّ شکاو ( دلّی شکاوه ) ، دووربین ( مرۆڤیکی دووربینه ) ( بروانه ماکه ره س ل . ۸٤ )

پیّویسته لیّره دا له جۆریّکی تری ووشه ی لیّکدراو بدویّین که هه ندی جار به لیّکدراوی ( هه ل نـه گه راوه ) نـاو ده بریّ . ( سـوامینائـان . ل ٤٢ ) . له م جۆره شدا دوو ووشه ی سه ر به یه ك به شی ئاوخاوتن ده دریّته پالّ یه کتر وبه هۆی ئامرازیّکی په یوه سته وه گریّ ده درین لیّکدراوه که شیّوه یه کی وا وه رده گریّ : ( و + ئامراز + و ) وه ك : حازروبزر ، ریّك وپیّك ، به ژن وبالاّ ، چه پ وراست ، شیر وتیر ، هات وچۆ ، . . . . . زۆر جار به شی دووه می لیّکـدراوه که واتـای یـه که م خـه ست ده کاتـه وه وله سـه ر وه زنی یـه کـه م داریّـژ راو . دوو جـۆر په یوه ندی له نیّوان دوو پارچه ی لیّکدراوه که دا تیّ بینی ده کریّ :

( ١ ) په یوه ندی فۆرم : ماڵه ومالْ ، شاره وشار ، ره نگاو ره نگ .
( ٢ ) په یوه ندی واتایی که یه کێك له م دۆخانه وه رده گری :
أ : هاواتایی یان واتانزیکی : دوو وشه که هاوواتایی یان واتا نزیکی کۆیان ده کاته وه ، نموونه : دۆست وبراده ر ، توندوتیژ ، ساردو سه رما ، شوخ وشه نگ ، قاچ وقول ، به ژن وبالاْ ، فش وفۆڵ ، نه رم وشل .
ب ـ به رامبه ری : حازرو بزر ، هات وچۆ ، چه پ وراست ، راست وچه وت ، دۆست ودوژمن ، ترش وشیرین .
جـ ـ : ته واوکه ری : ده م وچاو ، سه وزو سوور ، ژن وپیاو ، خزم وکه س ، ده رگاوبان ، ده نگ وباس .
وشه ی ئاڵوز له ئه نجامی لێکدانی وشه یه کی سه ربه خۆ وگیره کێ یان زیاتردا پێك دێ وگره کان یان له جۆری ڕێزمانیێن یان دارشتن . نموونه : ده خۆم ، ده م خوارد ، ، نه رمایی ، قوراوی ، سه وزایی . . . . هتد . دوو جۆره وشه ی ئاڵوزی دارێژراو جیا ده کرێته وه . ( ١ ) ئه وانه ی کاکله یان تێدایه و ( ٢ ) ئه وانه ی بی کاکله ن . کاکله یی ئه و جۆره وشه ئاڵوزه دارێژراوه یه که رتێك له خۆی ده توانی جێگه ی هه موو وشه که بگرێته وه.بۆ نموونه ، وشه ی (( جوانتر )) وشه یه که له م بابه ته . چونکه له هه مان رسته دا وشه ی ساده ی (( جوان )) ده چێته جێگای :

ئه م کچه زۆر جوانتره !
ئه م کچه زۆر جوانه

وشه ی دارێژراوی بێ کاکڵه ، به پێچه وانه وه ، که رتێکی وای تێدانی یه که بتوانێ جێگه ی هه موو وشه که له رسته یه کدا بگرێته وه ، بۆ نموونه ، وشه یه کی وه ك (( پیاوانه )) له م جۆره دارێژراوه یه چونکه رتی (( پیاو )) ناتوانی له رسته دا شوێنی بگرێته وه .

کارێکی پیاوانه بوو
* کارێکی پیاو بوو .
کارێکی چاك بوو.

ئه و وشه ئاڵوزه ی که هیچ وشه یه کی ساده نه توانێ جێگه ی

بگرێته وه پی ی ده وتری (( وشه ی گه ردانه )) . بۆ نموونه ، وشه یه کی وه ك (( ده خۆم )) یان (( ده م خوارد )) یان (( کوره کان )) هه رگیز وشه یه کی ساده جێگه یان ناگرێته وه ، له به ر ئه وه به وشه ی گه ردانه داده نرێن .

جگه له وشه و وشه ی لێکدراوو مۆرفیم دانه یه کی تریش هه یه له ئاستی مۆرفۆلۆجیدا که پی ی ده وتری (( ده سته )) . ده سته له رێزمانی کۆندا ئه و کۆمه ڵه وشه یه یه که ناوێ کاری تێدا بی و ( به مه له لارسته ی جیاده که نه وه ) هه موویان پێکه وه له رسته دا ئه رکی ناویان ئاوه ڵکار .... هتد ده بینن . بۆ نموونه : له سه ر دیواره که ، بۆ کری ، له ترساندا به په له ، سه عات دووی پاش نیوه رۆ ، دووپیاو .. له بۆ چوونه رێزمانه نوی یه کاندا (( ده سته )) به م واتایه به کارنایه ت و به کارهێنانی بیره که ته واو جیاوازه . بۆ نموونه له لای کۆمه ڵی پۆل و رۆنان ( کۆمه ڵی هالیده ی ) ده‌سته ده توانی یه ك وشه بێت و کاری تێدا بێت . له شیکردنه وه‌ی رسته یه کی وه ك :

(( به ته نیا ده توانم ئیشه که به رێك و پێکی ته واو بکه م ))

ئه م کۆمه ڵه سی جۆر ده سته جیاده که نه وه : (( ( من ) به ته نیا )) ( ده سته ی ناو ) ، (( به رێك و پێکی )) ( ده سته ی ئاوه ڵکار ) ، ده توانم ته واویکه م (ده سته ی کار ) ئیشه که ( دیسانه وه ده سته ی ناو ) . هه ریه کێك له م ده ستانه به لای که مه وه له سه ره یه ك ( دیارخراو ) پێك دێت ( نموونه : ئیشه که ) به لام زۆربه یان له دیارخه روو دیارخراو پێك هاتوون ( به ته نیا ) ( دیارخه ر ) ، (( من )) ( دیارخراو )) . به لای ئه م کۆمه ڵه وه گرنگ ئه وه یه که وشه ده سته پێك دێنی و ده سته ش هه ر ده بی لارسته پێك بێنی و ئه مانیش رسته . هیچ له م دانانه له هیچ کاتێکدا لانه برێن ، به واتایه کی تر وشه هه رگیز یه کسه ر نابێت به لارسته .

به شێوه یه کی گشتی ده توانین بڵێین ده سته له دیارخراوێك و دیارخه رێکی یان چه ند دیارخه رێکی پێك دی که جێگه ی تاکه و وشه یه ك بگرنه وه له رسته دا . مه‌کعه‌ره س ( ل ٩٢ ) دوو جۆر ده سته له کوردیدا جیا ده کاته وه :

## ١ . ده سته ی نـاو :

له م جۆره دا دیارخراو یان ناو یان ئاوه ڵناو یان جێ ناو یان پارتێکڵ . دیارخراویش دوو شوێن ده گری یان پێش یان پاش دیارخراو . ئامرازی ( ی ) ئیزافه

له نێوانیاندا ده بێ و هه موو رۆنانه که ده کات به کاکڵه دار : نموونــه :

| أ . دیارخـــراو | ک | دیارخـــه ر |
|---|---|---|
| پیاوی | | گـــه وره |
| بـــرای | | خـــۆت |
| کـــوری | | بـــاش |
| دیارخـــه ر | | دیارخـــراو |
| کـــام | | گـــۆل |
| چـــه ند | | نه‌فـــام |
| ئـــه و | | رۆژانـــه |
| دوو | | خانـــوو |

هه ردوو جۆره که هه ندی جارێکه وه ده بینرێن له چه ند شیوه یه کدا :

| ١ . دیارخـــه ر | دیارخـــراو | دیارخـــه ر |
|---|---|---|
| دوو | ژنـــی | ســـه ره |
| چـــه ند | ساڵێـــکی | تـــاڵ |
| کـــام | گـــوڵی | کێـــوی |

| ٢ . دیارخـــه ر | دیارخـــه ر | دیارخـــراو |
|---|---|---|
| چـــه ند | بـــه | جـــۆشه |
| چه نـــد | بـــی | ویژدانـــی |

| ٣ . دیارخـــراو | -ی- | ده سته یه کی تـــر |
|---|---|---|
| ماڵـــی | | کاوه یسی ئاشـــه وان |

| به فرووشیار | | ولاتی |
| --- | --- | --- |
| چنیفی مالفروو | | کارگه ی |

| لارسته ( لیکده ر ) | - ی - | ٤ . دیارخراو |
| --- | --- | --- |
| ( که ) لای من دانیشت | | پیاوه که ی |
| ( که ) من هه لم بژارد | | ئه وه ی |
| ( که ) له تاریکیدا ده ژین | | ئه وانه ی |

## ۲ . ده سته ی کار :

له م روونانه دا دیارخراو کاره و دیارخه ر ئاوه لکاره ، ئاوه لناو یان ناو . دیار دیارخه ر پیش کاره که ده که وی : -

ده سته ی کار له م شیوانه دا ده بینری :

۱ . ئاوه لکار + کار : هه ل کرد ، ده رکرد ، داگرت .

۲ . ناو + کار : شه ری کرد ، یاری کرد ، سویندی خوارد .

۳ . ئاوه لناو + کار : شرکرد ، سرکرد ، پیس کرد ، سوورکرد ،

یه که م و دووه م هه ندی جار گه وره و له م شیوانه دا ده رده که ون :

أ . ئاوه لکار + ئاوه لکار + کار

پی دا گرت ( پیٰی لیٰ داگرت )

تی به ردا ( سه گه که ی تیٰ به ردام )

ب . ناو + ئاوه لکاو + کار

شه ر هه ل گیرسان ( شه ریکی هه ل گیرساند )

نامیلکه ده ر کرد ( نامیلکه یه کی ده رکرد )

## ۷ لارسته و رسته : -

وه ك دانه کانی تری زمان رسته و لارسته ش قسه یه کی زورباں له سه ره و زمانه وانه کان له سه ر ناسینه وه و پیناسه کردنیان ریك ناکه ون . هه رئه م ریك

نه که وتن و جیاوازییه ی نێوان زمانه وانه کانه که واله د . کریسته ل ( ۱۹۷۱ ل ۲۰۰ ) ده کات باوه ری وابێت که هه رگیز (( باشترین پێناسه ی رسته )) نادوزرێته وه . هه ندی زمانه وان رسته و لارسته له یه کتری جیاناکه نه وه ، هه ندێکی تر به هیچ جۆری له لێکولینه وه کانیدا دان به بوونی لارسته دانانێن ، هه ندێکی تریش واز له رسته دێنن و (( گوتن )) له کاره کانیاندا به کاردێنن . بۆ نموونه له شیکردنه وه ی پرسیارو وه لامێکی وه ك ئه مه ی خواره وه دا :

بـو زووتر نه هاتـی بۆلام ؟

پێری دووجـار هاتم ، به لام لێره نه بوویت .

هه ندی زمانه وان هه موو دیارده که بـه (( گوتنێـك )) داده نێن و هه نـدێکی تر که ره سه ی هه موی به دوو رسته داده نێن و زمانه وانیش هه یه هه مووی به سێ لارسته ده زمێری .

رسته له هه مو دانه و مانیه کانی تر زورتر پێناسه ی جیاجیای بۆ دانراوه ( فریز تا ..اڵه کانی په نجا زیاتر له ۱۵۰ پێناسه ی رستـه ی کۆکـرده وه ) . هه نـدی له م پێناسانه ( وه ك رسته ئه و کۆمه ڵه وشه یه یه که واتایه کی ته واو ده رده بری ) ته واو ئێستاکه له زمانه وانیدا به ناله بارو ناپه سه ند داده نرێن ، هه ندێکی تر ( وه ك : رسته دانه یه کی زمانی سه ربه خۆیه یان رسته رۆنانێکه لـه گوزاره و نیهـاد پێك هاتووه ) . تائێسته ش له کاره زمانه وانیه کاندا ده بینرێن هه رچه نده ره خنه یان زۆر له سه ره و بێ سوودن و ته نـانه ت رستـه له لارستـه ش جیانـاکه نـه وه له و پێنـاسه ی رستـه که ئێستـه که بـلاوترین و پـه سه نـدتـرن ئـه وانـه ن کـه رستـه به گه وره ترین دانه داده نێن له شیکردنه وه ی رێزماندا . بێ گومان ، ئه م جۆره پێناسانه . ئه وه ناگه یه نن که له شیکردنه وه ی رێـزمانـدا دانه نی یـه که لـه رسته گه وره تربێت به پێچه وانه وه له م سالانه ی دواییدا له هه ندی زمـاندا سـه لماوه کـه دانه لـه رسته گـه وره تر هـه یه و سنـووریشی به ئـاسانی بـه هۆی نیشـانه ی رێزمانیه وه ده توانرێ دیار بکرێ . ئه م دانه زمانی یه گه ورانه هه ندی جار به (( گوتـن )) و هه ندی جاریش به په ره گراف ( واته فه قه ره ) ناو ده برێن به لام رسته بلاوترین دانه ی زمانی گه وره یه که کـه زۆربه ی زمـانه وانـه کان دانی پێـداده نێن و ده یناسنه وه و باوه ریان وایه که ده توانی چاری رۆنان و پۆله رێزمانییه کان بکات .

چاكترين پێناسه ی رسته ئه و جۆره یه كه رسته له گه ل دانه رێزمانییه كانی تردا (به تایبه تی له رسته ) گری ده داو شوێنی له زماندا به پی ی ئه مان نه ك له بۆشاییدا لێك ده داته وه ، ئه م چه شنه پێناسانه ئاسایی رسته به به رزترین دانـه ی زمانی داده نێن و په یوه ندی له گه ڵ لارسته دا شی ده كه نه وه . سیمای سه ره كی رسته ئه وه یه كه ئه و به ره یان ئه و راده یه مان بۆ نیشانه ده كات كه تێیدا كه ره سه ی زمانی ئه وه نده گه وره ده بێت كه ئیتر رێزمان ناتوانی خۆی له قه ره بدات یان خۆی نـادات به ده ست رێـزمانـه وه . زاراوه ی رسته كـه ره سه یـه كی زمانی تـه واو ده گرێته وه كه هه موو كه رتـه كانی لـه گه ڵ یـه كتری و لـه گه ل كـه ره سه كـه هه موویدا په یوه ندیكی به تینیان هه بێ ، له هه مان كاتیشدا له كه ره سه ی تری وه ك خۆی ترازاوی و دابراوی بۆ نموونه ، رسته یه كی وه ك : (( له شاری به فره وه هاتووه )) كه رته كـانی په یـوه ندییـه كی ته واویـان له گـه ڵ یه كتـریدا هـه یه و هه موشیان له گه ل رسته كه دا په یوه ندییان هه یه ، به لاّم له هه موو رسته یه كی تری كوردی دابراوه و ترازاوه و پێـویستی به كـه ره سه ی تـر نی یه تـاوه كو لێـك بدرێته وه . له م رووه وه رسته له هه موو دانه كانی تر جیاوازه چونكه په یوه ندی رێزمانی له گه ل كه ره سه ی ده ره وه ی خۆیدا نی یه ، به واته یه كی تر به شێك نی یه له كه ره سه ی ترو به هۆی ئه وانه وه كار ناكات و واتاكه ی لێك نادرێته وه .
به كورتی ، رسته دانه یـه كه كـه خۆی بـه هۆی تـواناى خـۆیه وه و بێ یـارمه تی كه ره سه ی تر ده چێت به رێ . كه واته رسته به هـۆی ترازانـدن و دابرینیـه وه له كه ره سه ی تر پێناسه ده كری و به پێچه وانه ی دانه ی زمانی تر ( مۆرفیم ، بۆ نموونه ) هه ر له خوارتره وه لی ی ده كۆلرێته وه ( به واتای ئه وه ی ، لارسته پێكی دێنی و خۆی دانه ی گه وره تر پێك ناهێنی ) . ئه م چه شنه پێناسانه ی رسته كۆنه و له كاره كانی بلوم فیلدا په نجه ی بۆ راكێشراوه . به باوه ری بلووم فیلد له هه موو گوتنێكدا هه ر فۆرمێكی زمانی وه رگرین یـان وه ك دانه یـه كی سه ربـه خۆ یـان ناسه ربه خۆ ره فتار ده كات . هه ر فۆرمێكی زمـانی سه ربـه خۆ بێت ( نـه بێته به شێك له كه ره سه ی گه وره ترو په یوه ندی رێزمانی له گه ل كه ره سه ی تردا نه بێ ) ئه وا رسته پێك دێنی . به م پێ یه رسته ئه و فۆرمه زمانی یه سه ربه خۆیه یه كه په یوه ندی رێزمانی نه ی كردووه به به شێك له فـۆرمی زمانی گـه وره تر .
سترانگه ، ١٩٦٢ ل ٧١ ـ ٧٣ ) .

ئه م راستیانه ی سه ره وه ئه وه مان بۆ ده رده خات که رسته له پله دا له هه موو دانه زمانییه کان به رزتره و که ژماره یه کیش رسته به دوای یه کتریدا هاتن و چوونه پالّ یه کتری ئه وا بابه ته که ده بێ شێواززان نه ك زمـانه وان لێ ی بکـۆلّێته وه .
بێ گومان ده بێ ئـه و راستیێ لـه بیر نـه که ین کـه زۆر جار ژمـاره یه ك رستـه ی به دوویه کتردا هاتووه په یوه ندی رێـزمانییـان که م و زۆر لـه نێوانـدا ده بێ وه ك رێکـه وتن و گۆرانی جێ نـاو . . . . هتد بـه لاّم ئه م پـه یوه نـدییـانـه کـه من و گرنگیه کی وایان نی یه چونکه لێکدانه وه ی رسته که بێ ئه مانیش ده بێ . دیسانه وه ئه م په یـوه ندی یـه رێزمـانییه هینـده زۆر نی یه کـه به راوردکـرێ له گـه لّ ئه و ئازادییه ی که رسته هه یه تی . بۆ ئه وه ی بتوانین په یوه ندی نێوان لارسته و رسته دیاری بکه ین ده بێ ئه وه بزانین که دانه یه ك یان زیاتر له دانه کانی ئاستی ژێره وه ده توانن دانه یه کی سه رووتر پێك بهێنن . له م ته روانینه وه لارسته ئه و رۆنانه یه که که رەسەیپرۆنانێکی سه روو خۆیه تی . به م پێ یه ئه و ته واییـه ی که رستـه هه یه تی له وه وه هاتووه که نابێ به که ره سه بۆ پێك هێنانی دانه ی گـه وره تر ) ( Strang P. 76 به واتایه کی تر رۆنانه کانی به رسته داده نرێ که مه رجه که ی بلووم فیلدی تێدا بێ . ( په یوه ندی رێزمانی له گه ل ده ره وه ی خۆیدا نه بێ ) .
ئه گه ر ئه م مه رجه ی تێدا نه بوو ، ئه وا هه مان رۆنان ده بێته لارسته ، بۆ نموونه :
١ ، ٢ ، ٣ له خواره وه رسته ن ، به لاّم ٤ ، ٥ ، ٦ لارسته ن :

( ١ ) ئه م به رچاوتی گرتووه .

( ٢ ) خێل بارده کـات .

( ٣ ) بالّنده ناگریـن .

( ٤ ) که ته م به رچاوتی گرت . . . .

(٥) ئه گه ر خێلّ بارکـات . . . .

( ٦ ) تا بالّنده نه گریـن . . . . . .

زۆربه ی ئه و رێزمان نووسانه ی که ئه مه بیـرییانـه ، رسته ده کـه ن به سێ به شه وه : ساده و لێکدراوو ئالّوز . به مه نه ك هه ر پۆلّینه که (( به نـد ) و (( ئـازاد)) دێنه وه کار ( فاول ل ١٢ )

| جـۆر | وـ وشه | رستــه |
| --- | --- | --- |
| ( ۱ ) ساده ( یه ك دانه ی ئازاد لـه ئاستی نزمتـر ) . | دار | داره کــه کــه وت |
| ( ۲ ) لێکدراو ( دوو دانه یان زیاتر له ئاستی خواتر ) . | دار خورما | داره که که وت وگه لاکانی وه ری |
| ( ۳ ) ئاڵۆز ( دانه یه کی ئازادو یه کێکی به ند له ئاستی خوارتر ) . | داره که | که داره که که وت گه لاکانـی وه ری |

به پێ ی ئه م باوه ره رۆنانی ساده ( رسته یێ یان لارسته ، ده سته یێ یان وشه ) . له یه ك دانه ی ئاستی نزمتر دروست ده بێ و رۆنانی لێکدراویش ده بێ دووان له م دانانه یه کسه ر هاوبه شی تێدا بکه ن و رسته ی ساده ش ده بێ له ( به ك لارسته پێك بێت .

زۆربه ی زمانه وانه کان له سه ر ئه م بـاوه ره ی سه ره وه رێـك ده که ون ، به لام که دێنه سه ر شیکردنه وه ی رسته ی ساده جیاوازی سه رهـه ڵ ده داته وه هه ندی رسته ی ساده که رت ده کهن بۆ ( نیهادو گوزاره ) یان ( بکـه رو کارو سه ربار ) . ئه مه به باوه ری هـه ندی زمـانه وان ( Strang , 1962 , 228 ) ده رچوون و لادانه له پێناسه ی (( رسته )) چونکه ئه مانه ( بکه رو کارو سه رکار ) که ره سه ی لارسته ن نه ك رسته . ئه گه ر رسته ی ساده له لارسته پێك هاتبی (وه ك پێناسه که ده ڵـی ) ده بێ که رت بکرێ بۆ که ره سه کانی لارسته که ده سته ی ساده و لێکدراوو ئاڵۆزن نه ك بکه رو کارو سه ربار . به باوه ری فاوله ر ( ل ـ ۱۱ ) رسته یه کی وه ك (( نانه که م خـوارد )) ده بێ به م جـۆره شی بکرێته وه :

( ۱ ) رسته یه کی ساده یــه .

( ۲ ) له لارسته یه کی لێکدراو پێك هاتووه . ( سێ ده سته هاوبه شی پێك هێنانی ده کات ) .

( ۳ ) رۆنانه که ی له سه ر نموونه ی ( بکــه ر + سه ربــار + کــار ) .

( ٤ ) هه ر یه کێك له م که ره سانه به هۆی ده سته وه پێـك هاتـوون که لێـره دا

ده سته ی ساده ن ( به واتای ئه وه ی ئه وه ی بکه رو سه ربارو کار هه‌ریه که یان له یه ك وشه پێك هاتـوون ) .

به باوه ری فاوله ر رسته دانه یه که که ( ١ ) له رووی ڕێزمانه وه په یوه ندی به ده ره وه ی خۆی نی یه و ( ٢ ) وه ك رۆنانێکی پێك هاتوو له بکه روکاروسه ربار شی ناکرێته وه و ( ٣ ) له لارسته یه ك یان زیاتر پێك هاتووه وو ( ٤ ) نابێت والێك بـدرێته وه کـه له لارسـتـه ی (( نـزم بووه وه )) دروست بـووه چونکـه ئـه مـانـه راسته وخۆ له رۆنانه که دا هاوبه شی ناکه ن . دیسان به لایه وه لارسته ش چه ند تایبه تیه کی تێدایه وه ك : ( ١ ) رسته پێك هێنه ره ( ٢ ) خۆی له ده ستـه پێك هاتووه ( ٣ ) زۆرجار که ره سه کانی پله ده گۆرن ( نزم ده بنه وه ) له به ر ئه وه ده بنه به شێك له ده سته و ته نانه ت وشه ش .

رسته ی ساده له کوردیدا له چـه ند شێـوه یه کی دیـاری کراودا ده بینـری (به پی ی جۆری کاره که ) که گرنگترینیان ئه‌وانه ی خواره وه یه : -

أ . کاری (( بـوون )) : -

ئاوه ڵناو : ئه و ئازایـــه .

١ . ( بکـه ر ) + ( نـاو + کـار ) : ئێمه قوتابین .

٢ . ( بکه ر ) + ( ئاوه لکار + کـار ) : ( مـن ) له ده ره وه بووم .

ب . کاری تێپه ر : ( بکـه ر ) + ( کار + کار ) : ( من ) نانم ئه خوارد .

ج - کاری تی نه په ر : ( بکه ر + کار ) : ( ئـه و ) هــات .

د . کـاری هه بـوو : ( بکـه ر ) + نـاو + کـار ) : ( ئـه و ) خانوویه کی هه یـه .

و . کاری تێپه ر : ( جـووته به رکار ) : ( بکـه ر ) + به رکار + کار + به رکار : کتێبه که ی دامی .

ی . کاری خۆپیشاندان : ( بکـه ر ) + ( خـۆ ) + نـاو / ئاوه ڵناو + کـار ) .

ئه و خـۆی ماندوو نیشان دا .

( ئه و ) خۆی به گه وره ده زانی .

ئێوه هه ر خۆتان به راست ده زانن .

خـۆی به پاڵه وان دێته به رچاو .

خـۆی به که س نادا / ناگورێته وه .

ئێمه به هیچ داده نـــی .

## به شی سێیه م

## گه شه و گۆڕان

### أ- گه شه له زماندا :

هه ر چه ند زۆربه ی زمانه وانه کان زمان وه ك ته نێکی ریکو پێك ئالـۆزی داخراو سه یر ده که ن ، له راستیدا له هه ر زمانێك ورد بینه وه له هه ر کاتێکـدا ده بینن له چه ند شێوه یه کی ( زاریکی ) جیاجیا پێك هاتووه . ئه وه ته له کاره مێژوییه کاندا رێبازی به را ورد کردن هه موو جیاوازییه کی نێوان زاره کان ده خاته پشت گوی و دوو زمان ( له گه ڵ یـه کتریـدا به راورد ده کـات بۆ ئه وه ی تێـان گه یه نی ئه م دوو زمانـه کامـه ن یان چـۆن گه یشته ئه م دوو زمـانه . کـۆمه ڵی چۆمسکیش به وه خویان له زاره جیاجیاکانی زمانێك دوور ده خه نه وه که ده یانده ن به به شی راپه راندن ( له زماندا وئه م به شه ش داده نین بۆ قۆناغی تر .
(Wardhangh , 1972 , 218 )

ئه گه ر زاره جیاجیاکانی زمانیش بۆ ماوه یه بخه ینه پشت گویّ له پێناوی ئه وه دا که زووتر یان به ئاسانیتر بگه ینه تیورێکی زمانی ، ده بێت ئه وراستیه له بیر نه که ین که زمان زاری جیاجیازۆره وهه ر قسه که ری به جۆری له بارێکی کومه لایه تیدا به کاریان دێنی وزمان بریتی یه له و تایبه تیانه ی که هاوبه شه له نێوان زاره کاندا .

(٦ ئه و هۆکارانه ی هه مه جۆری له زماندا دێننه کایه وه): ـ ( Wardhaugh , 230 )

أ ـ ته مه ن : زمان به پی ی ته مه نی قسه که ر ده گۆڕی . ئه م گۆڕانه ده گرێته وه بۆ ئه وه ی که زمان به فێربوون له نه وه یه که وه بۆ نه وه یه کی تر ده روات وئه م فێر بوونه ش هه رچه نده له ته مه نی شه ش سالی ساواکه دا ته واو ده بێ کاتی ده وی و بـه چه نـد قونـاغێکدا تێپـه ر ده بی . هه مـوو کـه س هـه ست بـه وه ده کـات که هه ره پیره کان وه ك هه ره گه نجه کان قسه ناکه ن وه بۆشاییه کی زمانی له نێوان نه وه کاندا هه یه . جگه له مه ش شێوازی قسه کردن له گه وره وه بۆ بچووك یان

له بچووکه وه بۆ گه وره (( باوك بۆ منالّ و منالّ بۆ باوك )) ده گۆری . ئه م گورانه به تایبه تی له هه لبژاردنی وشه دا هه ستی پیّ ده کریّ .

ب ـ جینس و کار :

پیاو و ژن جیاواز قسه ده که ن . هه ندی وشه له فه رهه نگی پیاودا نی یه و ( وه ك : به ساقه ، گیانه ، دایکی بمریّ ، جگه ره کێش دائه نیشم ، باوانت شێوی ، سه ری زمانت به برین چی ، سکت ئه سووتیّ..... هتد ) جنیویش له لای پیاو زیاتر به کار دی . له ئاستی تریشدا ( ئاستی ده نگه ) ( رسته سازیشدا )زمانی پیاو له زمانی ژن جیاده کرێته وه . جگه له مه ش شێوازی قسه کردنمان لـه گه لّ ژن و پیـاودا جیاوازه ، بۆ نموونه ، ئاساییه به ژن بوتری . (( ئه مرو له رۆژان جوانتری )) ، به لاّم به پیاو واناووتری .

زمانی که سێك ( به تایبه تی فه رهه نگی زمانه کـه ی ) به پی ی کـاره که ش ده گۆری چونکه ئه و زاراوانـه ی تیّده که ویّ کـه له کـاره که یـدا به کـاردی . سه رباز ، دانساز ، قژبرو مامۆستا هه ر یه که یان زاراوه ی جیاواز به کاردێنن . دیسانه وه ئافره ت له ژیر کاری ئیشه که یدا واچاوه روان ده کریّ ئه و زاراوانه زیاتر شـاره زابێت که پـه یوه نـدی به درووماـان و چێشت لێنانـه وه هـه یـه وه ك لـه و زارانه وانه که په یوه ندی به سه یاره و ته له فزیون و رادیوه وه هه یه . هه ندی جار له به ر ئه وه ی ئه م زاراوانه له فـه رهه نگی هـه موو کـه سێکدا وه ك یـه ك نین هه ست ده که ین که ناتوانین به رامبه ره که مان ( که کارێکی جیاوازی هه بێت ) تـی بگه یه نین .

جـ ـ ئـــه رك : ـ

دیسـانه وه زمـان به پی ی ئـه رکی کۆمـه لایه تی ده بێت بـه چه نـد زارێکی جیاجیاوه . وه ك زاری رسمی و ناره سمی و بازاری . . . . هتد . شێوه ی نووسین ، ئـاسایی ره سمیتـره له شێـوه ی قسه کـردن چونکـه ماوه ی پێـدا چوونـه وه و چاککردنی و شه و سنتیاکسی تی ده که ویّ . شێوازی بازاری له هه موویان نزمتره له رووی کۆمه لایه تیه وه و یه کێك له تایبه تیه کانی ئـه وه یه کـه زۆر زوو له نـاو ده چیّ و پره له ووشه ی شکاوو کورت کراوه . واله خواره وه چه ند نموونه یه ك له سه ر زاری ره سمی و زاری ناره سمی ( پــه له ) ده ده یــن :

تــوخــــوا — تخــــوا.

باست ناكـه م — باسي ناكـه م . . . .

چي بكـــه م ؟ — چيبكـــه م ؟

د ـ شويّـــــن :

به پێچه وانه ی زاره كانی تره وه كه زۆر جار خراونه ته پشت گوێ ، جیاوازی زاره كان به پێ ی شوێن له وبابه تانه یه كه زمانه وانی زیاتر بایه خی پێداوه ، ئه م بایه خدانه ش ده گه رێته وه بۆ ئه و په یوه ندییه ی كه له نێوان زمانـه وانی نوی و لێكدانه وه ی فیلۆلۆجی دا كونتردا هه یه كه تێیدا زمان بـه هۆی هـه مه چـه شنی زاراوه وه كه رت ده بێ تا به ره به ره زمانی تری لی په یدا ده بێت . بۆ نموونه ، ئه م كاری كه رت بوونه بوو به هۆی په یدابوونی گریكی كۆن و لاتینی و سه نسكریتی له زمانی هیندو ئه ورووپی بنچینه وه و یان په یدا بوونی فه ره نس و ئیتالی و ئیسپانی له گه شه و كه رت بوونی لاتینیه وه .

زار به و شێوه زمانه ده وترێ كه كۆمه ڵه كه سێك له شوێنێكدا به كاری دێنن و هـاوزمانه كانیشیان تێیان ده گه ن . بـه پێ ی ئـه م پێناسـه ي (كانتـۆنی ) و ( ماندرینی ) به دوو زمانی جیاواز دادهنرێن نه ك دوو زاری زمانی چینی چونكه قسه كه رانی به زاری كانتۆنی له و كه سانه ناگه ن كه بهماندرینی ده دوێن .

هه روه ها دانیماركی و نه رویجی ، ( هه ر چه نده زۆرجار به دووزمانی جیاواز ده ژمێرێن ) ، لێره دا به دوو زاری زمانێك داده نرێن چونكه قسه كه رانی ئه م دوو زاره له یه كتری ده گه ن ، هه ر چه نده دوو زاره كه ش لـه چه نـد لایه نێكـه وه له یه كتری جیاوازن . زاره جیاجیـاكانی زمـانێك ئـاساییی لـه م رووانه وه جیـا ده كرێته وه : ـ

## جیاوازی فۆنۆلۆجی : ـ

جیـاوازی فۆنۆلۆجی ئه م لایه نانه ده گـرێتـه وه : ژماره ی فونیمـه كان و چـۆنیه تی دابـه ش بوونی بـزوین و نـه بـزوین ، بـه شـداربـوونی فـونیمـه كـان له چوارچێوه ی برگه یی و وشه داو بوون و نه بوونی هێزو چۆنیه تی دابه ش بوونی له وشه و رسته دا . . . . هتد . بۆ نموونه ی له رووی فۆنۆلۆجیه وه ، جیـاوازی

نێـوان زاری ئامێـدی و شێخان و زاخـۆ . . . هتد ( زاره کـانی سـه روو ) زاری سلێمانی و هه ولێرو راوندز و موکری ( زاره کانی ناوه راست ) له م خالآنه دا به دی ده کـرێ :.

( ۱ ) بوونی / ك / و / گه / و / ب / ی سووك له زاره کانی سه روودا و نه بوونیان له زاره کانی ناوه راستدا . به م پێ یه ، سێ جۆر / ك /له زاری سه روودا به دی ده کرێ : / ك / قورس ، / ك / ی سووك و / ك / ی نه رم ( به ر مه لآشوو دراو ) . به پێچه وانه ی ئه مه وه ، ته نیا دوو / ك / له زاره کانی ناوه راستدا هه یه ، / ك / ی قورس و / ك / نه رم . ( بروانه وشه ی [ کا ] و [ کی ] زاری ناوه راست ووشه ی کار ( = که ر ) کـار ( = پارچـه ) زاری زاخو . (مه کنزی ، ۱ ، ل ٤۰ ) .

(۲ ) بوونی نه بزوینی گه وره کراو ( مفخمه ) له زاری سه ردوودا وه نه بوونی له زاری ناوه راستدا ( مه کنزی ، / ۱ ، ل ۳۱ ) . ده نگی / ص / و / ط / ته نیا وه ك ئه له فۆنی / س / و / ط / له زاری ناوه راستدا دێن ، به لام ئه م ده نگانه و / ظ / فونێمین له زاری سه روودا .

۳ ) زاره کانی سه روو بزوینی / ە / یان هه یه که بزوینیکی به رزه ، به پێشه وه ی زمان دروست ده کری و لێو خر کردنه وه ی له گه لدایه . بزوینی وا ( پێشه وه و لێو خر کردنه وه ی له گه لدا بێ ) له زاری ناوه راستدا نی یه . ( مه کنزی ل ۳۰ )

٤ ) زۆربه ی زاره کانی ناوه راست جیاوازی نێوان / ل و ڵ / یان تێدایه ( وشه ی په له ) و ( په ڵه ) به راوردیکه ) . له زاره کانی سه روودا ته نیا فۆنێمین / ل / هه یه . ( مه کنزی ل ۳۰ ) .

٥ ) هێشوه بزوێن له سه ره تای وشه دا له زاره کانی سه روودا زیاتر دێن وه ك له زاره کانی ناوه راستدا . بۆ نموونه ، هه موو ئه م هێشوانه ( پر ـ ، در ـ مر ، ر ـ بب ـ دیـ ـ کیـ ، شر ـ ، سیه . . شبـ ـ ست ، شلك ، . . . ) له سه ره تای وشه دا له زاره کانی سه روودا ده بینرێن ، به لام ته نیا ( کێر ، جۆر ، بۆر ، شۆر . . . ) له زاره کانی ناوه راستدا دێن که ده نگی دوه میان نیوه بزوینه .

هه روه ها له کۆتای وشه شدا له زاره کانی ناوه راستـدا ته نیـا سێ نه بـزوێن ده چنه سه ریه ك به مه رجی یه که میان نیوه بزوین بێت و دوه میان خشوك بێت )

( tricatives وه ك له ( گه يشت و رۆيشت ) داده بينن . . له زاره كانى سه روودا ئاسايیه سێ ده نگى نه بزوين به دواى يه كتريدا بێن ومه رجيش نیه ناكه وى له چى جۆرى بن وه ك : له ته يرى بخورتى ( مه كنزى ل ٣٨ )

كريم پينج

گه ڵه كت گرت

هه ڵ ستا

له ناوه راستى وشه‌كه‌دا دوو زاره كه زياتر له يه كترى نزيك ده بنه وه وهێشوه نه بزوين له هه ردووكياندا زۆره .

٦ ) ته نيا له زارى سليمانيدا ده نكى / ه / له گه ل بزوينيكى پيشتردا له وانه يه نه گۆريت به نيوه بزوينى ( ى ) . له هه مووزاره كانى ترى كورديدا دوو بزوينه كه به هۆى نيوه بزوينيكه وه ده بێ جيا بكرێته وه . نموونه ( دێ ، گوێ ، كابرا ، جۆ ، + ه ـ دێ يه ، گۆيه ، كابرايه ، جۆكه . . . . ( سلێمانى )

شايانى تێ بينى يه كه له هه موو زاره كانى كورديدا نه بزوينى كـوتايى وشـه له دۆخيكى نـه چه سپـاودايه و لـه وانه يـه بقـرتى يـابگـورى بـه ده نگيكى نـزيـك به ده نكه كانى ده ووبه ريه وه . ئه م ديارده يه به تايبـه تى له نـه بزوينى خشـۆك وده ربازدا ده ر ده كه وى : ـ نموونه ( مه كنزى ل ٤٨ ـ ٤٩ ) :

سلێمانى : له به ر كرد = ( كرت ) / پاشايه ك ئه بى = باشايه گ . . . . .

سه رى به رز كرد = ( به رس ) / ئه كه ر شێت نيت = شۆى . . . .

گورج حه مامى ( بۆ داخست ) = گورج . . . . .

سه د پوليس = سه ت . . . .

ئاكرى : ئه ز خولام = ئه س . . . .

تو چێتوف حه كيمى = چێتوف . . . .

بيده ڤ من = بيده ڤ من

ده ست دا = ده زدا

بنگرد : ئه ويش دى = ئه ويژ دى

بى كثيف نيم = بى كه يڤ نيم

## ٢ ) جیاوازی ریزمانی :

جیاوازی ریزمانی به زوری له به شی موفولوجیدا ده بیٚ ( جیاوازی له گه رداند کردنی کار و کو کردنه وه ی ناو و گورینی شیوه ی ناوه لناو ناوه لکار ........ هتد ) هه ر چه نده ، جیاوازی له سینتا کیشدا ناو به ناو هه ر به دی ده کریٚ .

### أ ـ جیاوازی مورفولوجی : -

بو نموونه ، زاره کانی کوردی هه ر یه که یان به شیوه یه کی تایبه تی تافی رانه بردوو دروست ده کات وه ك له م خشته یه ی خواره وه دا ده بینین :

| سلیمانی | هه ولیر | زاره کانی سه روو | |
|---|---|---|---|
| کردن | ئه که م | ده که م | تکه م |
| | ئه خوم | ده خوم | تخوم |
| ئه بم | ده بم | وتبم | |

هه ر وه ها گه ردانه ی کاری هه بوون له زاریکه وه بو زاریکی تر ده گوری ، بابه ووردی به راوردی ئه م فورمانه بکه ین :

| سلیمانی | هه ولیر | وارماوه | زاره کانی سه روو |
|---|---|---|---|
| هه مه | هه یتم | هه سم | هه فه |
| هه ته | هه یتی | هه ست | |
| هه یه | هه یتیت | هه سی | هه یه |
| هه مانه | هه یتمان | هه سیان | |
| هه تانه | هه یتن | هه ستان | |

تێبینی : ( ١ ) له زاری سلێمانیدا ره گی کاره که ( هه ) یه وپاشگوی م ، ت ، ی ، مان ، تان .... چوّته سه ر . بزوێنی / ه / ی کوتایی تاقی رانه بردو بیشان ده دات :

هه مه ( ئێستا ) ، هه م بوو ( جاران )

٢ ) له زاری هه ولێردا هه یت ره گی کرداره که یه وباشگری ـ م ، ت ، ی ، مان ، ـ تان ، یان .... هتد چوّته سه ر

٣ ) له زاری وارماوه دا ( هه س ) ره گی کرداره و هه مان پاشگری بوّ که سه کانی چوّته سه ر .

٤ ) له زاری سلێمانیدا نیشانی تاقی ئێستا ده که وێته دوای پاشگری که سه کانه وه (م + ه ) ، له زاری هه ولێردا نیشانه ی تاقی ئێستا ده رناکه وی ، پاشگری که سی دەکەوێته دواوه .

## ب . سینتاکس :

له رووی سێنتاکه وه ئه م جیاوازییانه له نێوان زاره کانی کوردیدا به دی ده کرێ

١ ) له زاره کانی ناوه راستدا ناسینی ناو به هوّی پاشگری ( ـ ه که ) وه ده بێ ، له زاره کانی سه روودا ، ـ که ، ته نیا له گێرانه وه دا بوّ ناساندن به کاردی .
(مه کتزی ل ١٠٠ )

| زاره کانی ناوه راست | زاره کانی سه روو |
|---|---|
| پیاوه که ، شاره که | مروّڤه که کوتا ژنه که |
| ژنه که ، کچه که | بچوك ( = منالّ ، منالّه که |
| | منالّه کان ، منالاّن ) له زاری |
| | ئاکری دا ( مه کتزی ل ١٠٠ |

٢ ) هه ر چه ند هه ر دوو شێوه که ی راناو ( لکاو ونه لکاو ) له زاره کانی سه روو و ناوه راستدا ده بینرێن ، راناوی لکاو له زاره کانی ناوه راستدا هه میشه به کاره وه ده لکین . له زاره کانی خوارووودا کوّمه لیکیّان فێره خزاندته و ئاره زوی پێشی رسته ده کات :

| زاره كانى سه رو | زاره كانى ناوه راست |
| --- | --- |
| ئه تۆدرۆكرد | تۆدرۆت كرد |
| ئه و مه د خوت | ئێمه ده خوات |
| برايى هه نكۆ | براى تۆ ، برات ، براكه ت |
| مالاّ من | مالّى من ، مالّم ، مالّه كه م |
| من تۆ ئێناى | من تۆ هێنا |

( مه كتزى ل ٧٣ ) ( وريا عومه ر ، ١٩٨٣ )

٣ ) بو ده ربرينى كارى ناديار ، زاره كانى ناوه راست پاشگرى ـ را و ـ رى به كار دينن . له زاره كانى سه روودا ئه م پاشگرانه به ده گمه ن به ر چاو ده كه ون ، له جياتى ئه مانه يان ( ١ ) هاتن + ه + چاوك ( كه بكه ر نه زانرا ) به كار دێ يان ( ٢ ) كارى تێپه ر وه ك كارى ناتێپه ر گه ردانه ده كرێ ومانايه كى ناديار وه رده گرێ كاتێ بكه ر له رسته كه دا هه بێ .

| زاره كانى سه روو | زاره كانى ناوه راست |
| --- | --- |
| ١ ) باپيرى ما لبهه شتى هاڤيته ده رى | باپيره كانمان له به هه شت ده ركران |
| ٢ ) سندوقا شكاندنى | سندوقه كه يان شكاند |
| ٣ ) ئه ز ده رمان كرمم | من ده رمان كرام |
| ٤ ) زاد ئينـــا | نان هێنرا |
| ٥ ) سندوّقا هاتيه شكاندن | سندوقه كه شكێنرا |
| ٦ ) جه ند دزبى هاتينه كوشتن | جه ند دزيه ك كوژراون |

( مه كنزى ١٩٣ ـ ١٩٥ )

## ٣ ) جياوازى لێكسيكى ( فه ر هه نگى )

ئـه م جياوازيـه زياتـر لـه دوانـه كـه ى تـر هـه ستى پى ده كـرێ و لـه وه دا ده رده كه وى كه زاره كان وشه ى جيا جيا به كار دێنن بـۆ لێ دوان له ديـارده ى فيزيكى وكۆمه لايه تى ده وروپشتيان . هه ندى جاريش هه مان فۆرم به واتـاى

جیاواز لە زارە کاندا بە کاردیٚ . ئە م دوو جۆر جیا وازییە هە ر دووکیان لە زارە کانی کوردیدا دە بینرێن : ـ

أ ـ بە کار هێنانی وشە ی جیا جیا بو هە مان دیاردە :

بە راوردیکی ئە م فورمانە ی خوارە وە بکە لە زارە کانی ناوە راست و سە رووی کوردیدا کە بۆ هە مان دیاردە یان بە هە مان واتە بە کار دێن :

| زارە کانی ناوە راست | زارە کانی سە رە وە |
|---|---|
| دانسار | دان کێش |
| لی پرسراو | بە ر پرس |
| بە ناو بانگ | پیێـش چاف |
| پیاو کوژ | میر کوژ |
| نانی نیوە رۆ | فرا ڤین |
| گورانی | ستران |
| مە زن | گە ورە |
| کە رە | نفیشك |

تە نانە ت لە ناو زارە کانی ناوە راست خۆشیاندا جیاوازی لێکـێکـی بە دی دە کریٚ .

| زاری سلێمانی | زاری هە ولیر |
|---|---|
| کە ی | کە نگی |
| دە نووك | دە ندووك |
| دان | ددان |
| کچ | کیژ |
| خە و | خە ون |

## ب . هە مان فۆرم بە واتە ی جیاواز :

هە ندی جار هە مان فورم لە چە ند زارێکی جیا جیـا دا دە بینری ، بـە لاٚم بە واتای جیاواز . بۆ نموونە ، وشە ی گۆیە ند لە زارە کانی ناوە راستدا بە واتای

ئاژاوه دئ . هه مان ووشه له زاره كانى سه روودا ده بێته گوڤه ند وبه واتاى شادى دێت . هه روه هاوشه ى وه ربن له زاره كانى ناوه راستدا به واتاى هه ل وه رين ولێك جيا بوونه وه دئ ، به لام له زاره كانى سه روودا هه مان فۆرم به واتـاى ده ورگتن دێت . هه مان جياوازى واتايى له وشه ى داوه شێن داده بينرى .

له م سه د ساڵه ى دواييدا زمانه وانه كان رێگه ى ورد تريان بو ليكدانه وه و جيا كردنه وه ى سنوورى زاره كان دوزيوه تـه وه . چاكتـرين وبلاوتـرين ته كنيـك بۆ پشكنينى ناو چه يه ك و دوزينه وه ى سنوورى زاره كان و نووسينه وه ى ئه تله سى زاره كان ئه و رێگاى كه له سالى ١٨٧٦ جۆرج ڤينكر له ئه لمانيا به كارى هێنا .

ڤينكه ر جه ند فۆرمێكى ( ئيستاره يه كى ) به سه ر به ريوه به رى قوتـابخانـه ى گونده كاندا دابه ش كرد كه تێيدا داواى لى ده كردن چه ند رسته يه ك وه رگيرنـه سه رى زارى ناوچه كه . به م رێگايه ڤينكر ده يويست بزانيت تـاچى راده يه ك گۆرانى فۆنۆلۆجى ورێزمان ولێكسيكى له زمانى ئه لمانيدا به دى ده كرئ به هـه مان شێوه ( كيلبرون ) له فه ره نسا توانى ئه تله سى زاره كانى فه ره نسى ئاماده بكات . ئه و كارانه ئێستا له بريتانيا وبابان وولاته يه كگرتوكانى ئه مريكا به ده سته وه يـه ده رباره ى زاره كانى كه لكيكى زۆريان له م تاقيكردنه وانه ى ئه لمانيا وفه ره نسا وه رگرتووه .

ئه م جۆره ئه تله سانه دا به ش بوونى جوگـرافى ده نگێك يـان وشه يـه ك له زمانێكى ديارى كراودا له سه ر نه خشه ى گه وره پيشان ده ده ن . بۆ نمـوونه . نه خشه يه ك له وانه يه دا به ش بوونى جـوگرافى جـۆره جيا جيـاكانى ده ربـرينى ده نگێمان له و شه يه كدا پيشان بدات يان دابـه ش بوونى جـوگرافى جـۆره كانى دروست كردنى كردارى رابردوو يان رانه بردوو بخاته روو . زۆر جار سنوورى جوگرافى نێوان دوو زارى زمانێك ته واو روون وئاشكرايه و به وه ئه و دوو زاره له يه كترى جيا ده بنه وه كه هه ر يه كه يـان ياسـايه كى تـايبه تى هـه يه بـۆ رابردوو دروست كردى يان له هه ر يه كه ياندا فۆنێمێكى ديارى كراو بهجۆريك به كاردى . له كاتى وادا ، به واتاى ئه وه ى كه سنوورى نێوان روون ئاشكرا بووه زار ناسه كان به هێلێك كه پێده وترئ هێلس (( هه مان زار )) ( iscgloss ) ئه م دوو ناوچه يه له يه كتـرى جياده كـه نه وه . كـه ژماره يـه كى زۆر له م هێـلانه لـه شوێنيكـدا كربوونه وه وبۆ ماوه يه ك درێژ بوونه وه ، ( كه جياوازى له نيوان دووزاردازۆر بوو)

ئه و هێله ده بێ به هێلی سنووری نێوان دوو زار یان زیاتر . یه کێك له م هێلانه ، ئه و هیله یه که زاره کانی ناوه راست وزاره کانی سه روو له یه کتری جیا ده کاته وه .
هه ندی جار هێله کان هه موویـان له چـه قیکه وه ده رده چن یـان له خـاڵێکه وه بلاوده بنه وه . به چه قی واده وترێ . چه قی ناوچه ( focal orea ) . هه ندی جار پێچه وانه ی ئه م دیارده یه به ر چاو ده که وێ ، به واتای ئه وه ی چـه ندی هێلێك هه ندی جار به ره و چه قێك ده رون له چه ند ناوچه یه کی ده ورو‌به ریه وه . زار ناسه کان به چه قی واده لێن (( ناوچه ی برێن )) به وناوچانه ی که چه ند هێلێك تێیدا به جۆرێکی نارێك وپێك یه کتری ده برن ده وترێ (( ناوچه ی کاتی )) سلیمانی وهه ولێرو ره واندوز چه قی ناوچه ن له زاره کانی ناوه راستدا . ئاکـرێ وئامێدی وشێخان چه قی ناوچه ن له زاره کانی سه رووداا . موکریان ناوچه ی دێرینه . شـاره گه وره کـانیش که ژمـاره یه کی زۆر خـه ڵکی ده ورو‌به ر دێن وده چن تێایاندا به ناوچه ی کاتی داده نرین .
دوای ئه وه ی چه قی ناوچه و ناوچه ی دێرین وناوچه ی کاتی دۆزرایه وه . سنووری زاره کان دیاری کرا زارناسه کان هه وڵی ئه وه ده ده ن به هـۆی په یـدا بوونی ئه م زارا ناوچه بیانه پشان بده ن . مێژووی ئاوه دانکردنه وه ی ناوچه که زۆر جار په یوه ندیه کی زۆری به په یدا بوونی زاره وه هه یه . ( Wardhaugl , 223 - 25 )
ئه و ناوچانه ی کۆنن ، که متر رێگه به داهێنان ده ده ن وجیاوازی نێوان زاره کانیشی ئاشکراو دیارن . سنووری زاره کان ئاسایی په یوه ندییان له گه ڵ کۆچ وباردا زۆره وبارکردنی ژماره یه کی زۆر له دانیشتووان کارده کاته سه ر نـه خشه ی دابـه ش بوونی زاره کان . هه روه ها لێکدانه وه ی جیاوازی نێوان زاره کـان له نـاوچه ی ئاڵۆزو کاتیه کاندا ( وه ك شار ) زۆر گرانتره وه ك له ناوچه نه گورو ساده کاندا ( گونده کان ) .
شایانی باسه که ئه و گه شه یه ی که له مه و دوای گواستنه وه دا له م ساڵانه . دواییـدا رووی داوه رۆڵی کۆسپی جـۆگرافی لـه دابه ش کـردنی زاره کانـدا کـه م کردۆته وه . بۆ نموونه ، چیاکانی هه ورامان که لـه کاتی خـۆیدا بـونه تـه هۆی دابچـراندنی کـۆری ودروست بوونی زاری جیـاجیـا ، ئێستـه کی ئـه و کـوسپـه

گه وره یه نین وله وانه یه له چه ند نه وه یه کی تردا زاره کان به جۆریکی تر له م ناوچه یه دا دابه ش بن .

ته نانه ت ئه گه ر جیاوازی نێوان زاره کان زوریش بێ ، قسه کـ ر بـه زاری زمـانێك لـه زاره کانی تـریش که م وزۆر دهِ گـات . ئه م لـه یـه کـتر گـه یشتنـه ده گه رێته وه بۆ ئه و راستیه ی که هـه موو زاره کـانِ هه مـان پێره و بـه کار بێت وزۆربه ی کات جیاوازی نێوانیان له وه دایه که یاساکان پاش وپێش ده کرێن یان یاسایه ك له زارێکدا هه یه و له وپتردا نی یه . بۆ نموونه رسته یه کی وه ك :

مه چی کر ؟ ( زاری ئاکری ) مه کنزی ل ١٧٦ ) له زاره کانی سـه روودا (به تایبه تی له زاری ئاکریدا ) رسته یه کی به واتاو په سه نده ، به لاّم هه مان رسته له زاره کانی ناوه راستدا به رسته یه کی واتاداری ناپه سه ند داده نـری ، چونکـه یه کێك له یاسا سه ره کێکانی ئه م زاره ی بـه جی نه هێنـاوه ، ئه ویش دووبـاره کردنه وه ی بکه ره ( له شێـوه ی راناودا ) بـه مه رجی لـه کاتی کـاری رابردوودا به نزیکترین که ره سه ی رسته وه بلکی که توانای وه رگرتنی نیشانه ی هه بێت وه ك له خواره وه روونی ده که ینه وه :

ئیمه = هه = جی = جی کر = کردووه

= مان

ئێمه چیمان کرد ؟

## ب ـ گۆران له زماندا :

هه ر وه ك چۆن زمان به پێ ی شوێن ده گۆری وده بێت به چه ند زاریکی جیا جیاوه ، هه روه ها زمان به تێپه ر بوونی کات ده گوری وبه م پی یه کوردی سه ده ی هه ژده و حه ڤده ده بێ له کوردی ئه مـرۆ جیاواز بـوو بێت . ده رباره ی گـۆران به شێوه یه کی گشتی ده بێ سێ راستی له بیرنه که ین :

١ ـ هه موو زمانه کانی جیان هه میشه له گوِراندن وله توانای کـه سدا نی یـه ئه م گۆرانه راگری یان که می بکاته وه یان به ته واوی نه یهێلی چونکه گۆران له گه لّ هه لّکه وتی زمان خۆیدابهِ .

٢ ـ مه رج نی یه گۆران زمان به ره و تێکدان وهه لوه شـاندن ولـه ناو چـوون

به ر یۆ وه ك هه ندی كه سی ساویلكه باوه ڕیان وابوو ، به لكو گۆڕان له وانه شه زمانه كه ئاسانتر بكات ووزه پارێز بێ .
٣ ـ گۆڕان به پێ ی یاساو ده ستوور رووده دات وله خۆوه وبی سه رو شوێن نابێت . هه ر له به ر ئه مه شه كه ته نیا چه ند جۆریك له گۆڕان له زمانی مرۆڤدا ده بینرێت وهه ر ئه مانه ش به گۆڕانی ئاسایی داده نرێن .
ئاشكرایه كه گۆڕان له هه موو ئاسته كانی زماندا روو ده دات و ( ئاستی فۆنۆلۆجی وفۆنه تیك ، ئاستی مۆرفۆلۆجی سینتاكس وسیمانتكس ) له هه ر ئاستیكدا چه ند شێوه یه كی گۆڕان به دی ده كرێ .

## ١ ـ ئاستی فۆنه تیكی وفۆنۆلۆجی :

ئه م ئاسته ی زمان زیاتر له ئاسته كانی تر ده گۆری وزۆر تریش هه ستی پی ده كرێ . له م جۆره گۆرانه دا هه ندی دیارده له زۆربه ی زمانه كانی جیهاندا به دی ده كرێ :
أ ـ تواندنه وه ( لێكچوون یان گونجان )
لێره دا ده نگێك ده گۆڕی بۆ ده نگێكی تر له ژێر كاری ده نگه كانی د راوسێدا . هه ندی جار ده نگه كه ی پێشه وه ده گۆڕی وهه ندی جار ده نگه كه ی دواوه :
نموونه :
١ ـ ده نگی پێشه وه :

پێش + ره و ـــــ پێشره و / پێژ ره و /
پشت + ده ر ـــــ پشتده ر / پژده ر /
هه شت + ده ـــــ هه شت ده / هه ژده /
حه فت + ده ـــــ حه فت ده / حه فده /
سه د + پیاو ـــــ سه د پیاو / سه ت پیاو /
به ش + دار ـــــ به شدار / به ژدار /
گورج په تیكه ـــــ گورج په تیكه / گورج په تیكه /
پاشایه ك ئه بێ ـــــ / پاشایه گ ئه بێ )
ئه گه ر شێت نیت ـــــ / ئه گه ر شێد نین )

۲ ـ ده نگی دواوه :

چی بکه ین ـــــ چی پکه ین ...

ب ـ بوون به ده نگی دوولانه :

لێره دا بزوێنێك هه ندی جار ده خلێکی وده بێته ده نگێکی دوو لانه ( دوو پارچه) له یه ك برگه دا .

نموونه : لای ، ماین ، مه ی ، ئاو . . . . . ( له قمه ی هه ندی که سدا )

ت ـ کرتاندن ( له ناو چوون )

له م گورانه دا یه کێك له برگه کانی وشه یه ك له ناو ده چێ یان ده کرێ :

له + ئه م + به ر ـــــ له م به ر

ل + ئه م + ه ـــــ له مه

ل + ئه و + ه ـــــ له وه

هه ندی جار ده نگی پێشه وه ی وشه که له ناو ده چی و ( وه ك ئه شه ل ـــــ شه ل ) هه ندی جار ده نگی ناوه راست و ( وه ك تواندنه وه وکوژ اندنه وه ـــــ توانه وه وکوژ انه وه ) جاری واش هه یه ده نگی پێشه وه ودواوه له هه مان کاتدا (وه ك موحه مه د ـــــ حه مه ) . به لام له کوردیدا له نـاو چوونی ده نگی دواوه دیارده یه کی ته واو بلاوه وبه تایبه تی له زاری سلێمانیدا ده رده که وی ( کاك ـــــ کا ، ده ست ـــــ ده س ، شێخ ـــــ شی . . . . . هتد )

ج : دروست بوونی ده نگی نوی

هه ندی جار له ئه نجامی کۆبوونه وه ی ریشه ی وشـه یه ك وپـاشگرێـك ، ده نگێکی نوی دێته کایه وه بۆ جیا کردنه وه ی بزوێنه کان .

زۆربه ی جار ده نگی پێش بێنی ده کری ( هۆیه کی فۆنه تیکی ده دۆزێته وه بۆ لێکدانه وه ی ) به لام جاری واش هه یه کـه هۆیـه کی فۆنـه تیکی وامان نی یـه دیارده که مان بۆ لێکداته وه .

دی ، جۆ ، قاپی + ه که ـــــ

دی یه که ، جۆیه که ، قاپی یه که

( له هه ندی زاری کوردیدا )

خانوو ، جوانوو + ه كه ـــــ

خانوو وه كه ، جوانووه كه

( ديسانه وه له هه ندى زارى كورديدا )

بيخۆ + ه وه ـــــ بيخۆره وه ( له زارى سليمانيدا )

بيلێ + ه وه ـــــ بيلێره وه ( له زارى سليمانيدا )

## ح - ته بابى ( ائتلاف )

لێره دا دوو ده نگ ده چنه سه ريه ك به تايبه تى له كۆتايى وشه داو ده نگێكى جياواز ده هێننه كايه وه كه ناچێته وه سه ر هيچ كاميان .

نموونه : قاپى + ه كه ـــــ قاپێه كه ( ى + ه ـــــ ئى )

( زارى سليمانى ) جوامرو + ه كه ـــــ جوانۆكه ( وو + ه ـــــ و )

هه ندى جاريش هه ردوو ده نگه كه رى ده كه ون يه كێكيان ده مێنێته وه لـه برێتى هه ردووكيان . ئه م ديارده يه له كورديدا زوربلاوه به تايبه تى كه بزوێنێكى كـورت ويه كێكى درێـژ ده چنه سـه ريه ك ، ئـاسـايى درێـژه كـه ده مێنێتـه وه وهه ردووكيان ده نوێنى :

ئێواره + ئان ـــــ ئيواران / ه + آ ـــــ آ

به رده كه + ئان ـــــ به رده كان / ه + آ ـــــ آ

له ديوى + ه وه ـــــ له دوينى وه ى + ه ـــــ ى

له په رده +ه وه ـــــ له په رده وه ه + ه ـــــ ه

## خ - جيابوونه وه ى ده نگ :

هه ندى جار دوو ده نگى وه ك يه ك كه ده چنه سه ريه ك يه كێكيان ده گۆرى به ده نگێكى تر بۆ ئاسانى ، نموونه : -

پاش + شێو ـــــ پارشێو

پاش + سه نگ ـــــ پارسه نك

## د : جى گوركى :

له م ديارده يه دا دوو ده نگ يان دوو برگه جێگاكانيان ده گۆرنه وه هه ندى جار وشه كه به هه ردوو شێوه كه ى له يه ك زاردا ده بينرێن ، هه ندى جاريش هـه ر

شێوه ی له زارێکدا ده رده که وی وبه کار دیٚ . نموونه : ـ

١ ـ له نیوان دوو زاردا :

ته رزه ( سلێمانی ) ، ته رزه ( هه ولێر )

به فر ( سلێمانی ) به رف ( زاره کانی سه روو )

٢ ـ له ناو هه مان زاردا :

رفین ، فرین

روانین ، نوارین

هه ندی جی گورکی په یوه ندی به چینی کۆمه لایه تی وئـاستی روشنبیریـه وه هه یه وشێوه یه کی وشه که مۆرکی کومه لێکی تایبه تیه ، بۆ نموونه ، شێوه یه ك له م فۆرمانه ی خواره وه له قسه ی نه خوینده واردا زیاتر ده رده که وی :

| خوێنده وار | نه خوێنده وار |
| --- | --- |
| جومعه | جوعمه |
| روبع | روعب |
| له عنه ت | نه عله ت |

ر : ـ ده نگه گۆرکیٚ :

لێره دا ده نگێکی وشه یه ك له قسه ی هه ندی که سدا ده گوری به ده نگێکی تر له قسه ی خه ڵکی تردا بیٚ ئه وه ی ئه م گورانه بێته هۆی گورانی واتای وشه که . به واتایه کی تر ، هه مان وشه له دوو فۆرم یان زیاتردا ده بینری به هه مان واتا . دیسانه وه ، هه ندی جار هه ردوو فورمی وشه که له یه ك زاردا هه ن . جاری واش هه یه هه ر فۆرمه ی له زارێکی تایبه تیدا به کار دی .

١ ـ له نێوان دوو زاردا :

ئه سپ ( سلێمانی ) / هه سپ ( وارماوه )

به ستی ، ئه ییه ست ( سلێمانی ) ئه یوه ست ( وارماوه ) / وه ستی

جه واب ( سلێمانی ) / جه واو ( وارماوه )

سوور ( سلێمانی ) سۆر ( هه ولێر )

٢ ـ له ناوزاریکدا : ـ

ئاسمان / عاسمان

یونان / وینان

ز ـ به ر لیودان :

هه ندی ده نگ ( وه ك / ك / یان / گ / ) كه ده نگیكی لیوییان به دوودا دیت ، به ره و پیشه وه ی ده م ده رون ولیو خر كردنه وه په یدا ده كه ن له كاتی وادا به و ده نگانه ده وتری (( به ر لیـودارو )) وه ك ده نگی / گ / و / ك / ی كوردی له وشه ی (( كوا )) ، (( كوانی )) ، (( گواره )) ، گوان . . . هتد .

س : نه رم بوون ( به رمه لا شودان )

هه ندی ده نگ ( به تایبه تی ده نگی ده رباز : / ك ، گـ ، ب / . . . . . ) كه بزوینی ( / ی / ی / ) یان به دوودا دیت ده خلیسكین به ره و شوینی بزوینه كه ونه رم ده بنه وه . به واتایه كی تر ، به ره و تاكه كپه كانی خویان ده رون ( پ ـــــ جوریك له / ب / و / كـ / ـــــ جوریك له / چ / . . . . . هتد ) بو نموونه به راوردی ده نگی / ك / و / گ / و / ف / ي بكه له كومه لی یه كه م ودوومه مدا:

| ( ٢ ) | ( ١ ) |
|---|---|
| كی ، كیو | كا ، كار ، |
| كینه ، | |
| گیره | گا ، |
| فیل ، فینك | فال ، فاته |

ش : به ر لوت دان :

لیره دا ده نگیك ( به تایبه تی بزوین ) له ژیر كـاری ده نگه نـاو لووتیـه كانی ده ورویه ریدا له هه لكه وتدا له مانه نزیك ده بیته وه . بو نموونـه ، له كـوردیدا بزوین نی یه كه له لووته وه ده رچیت ، به لام كه‌مبزوینیكی ئاسایی ده كه ویته وه نیوان دوو ده نگی لووتیه وه ( وه ك م ، ن ، نگ ) یان پیش یه كیك له مـانه ، بزوینه كه وه ك ئه مانی لی دی له هه لكه وتدا . به باشی له ده نگی / آ / ی ئه م وشانه ورد ببه ره وه : نازانم ، پانزه ، شیانزه . . . . . هتد .

ع : **به رنه رمایی دان :**

لێره دا ده نگێك ( به تایبه تی / ل / و / / ) به ر نه رمایی مه لاّ شوده دری وده گۆرێت به ده نگێکی تر ( / ڵ / و / ڕ / ) . ئه م چوار گۆرانه ی دوایی (ده توانرێن بخرێنه ژێـر جوری یـه که می گـۆرانه وه ی ( تـواندنـه وه ) چونکـه له هموویاندا ده نگێك یان هه ندی له تایبه تی خۆی ده گۆڕی یان ته واو ده گۆری به ده نگێکی تر له ژێرکاری ده نگێکی دراوسیدا .

شایانی باسه که هه ندی گۆڕانی فـۆنه تیکی لـه مه و د ایـه کی ته سکـدا کار ده که ن به واتای ئه وه ی کاره که یـان ته نیـا له ژمـاره یه کی کـه می وشه کـانی زمانه که دا ده بینری وگوڕانیکی فراوان وبه ربلاّو ناهێنینه کایه وه . به لاّم هه ندی گوڕانی ده نگی هه یه که به شێوه یـه کی زور فراوان کـار ده که ن ، وپێـره وه ی ده نگی زمانه که هه مووی ده گۆڕن . ئه م جۆره گورانانه که پیـان ده ووتری (( گۆڕانی فۆنتکی )) له ئه نجامی دوو جۆر گه شه دێنه کایه وه : ـ

١ ـ که رت بوونی یه کێك له فوغیه کانی زمانیك وبوونی به دوو فۆنیم یان زیاتر وه ك ئه و گه شه یه ی که له فـونیمی / ل / ی زاری سلێمانیـدا ده بینری . بـه وه دا که ته نیا یه ك جور / ل / له زۆربه ی زاره کانی تردا هه یه ، ده بێت په یـدا بوونی / ڵ / گه شه یه کی دواتر بوو بێت . ئه مه کارێکی فراوانی کردوته نه ك هه ر پێره وی ده نگی زاره که خۆی. به ڵکو ته نانه ت زاره کانی تریشی هه ژا ندووه ، چونکه ناو به ناو له م زارانه شدا ده بیستری .

٢ ـ لکاندنی دوو فۆینمی جیاواز وبـوونیان بـه یه ك فـۆنیم ، ئه م دیـارده یه کی دیسانه وه له کوردی ئه مروماندا به دی ده کری . بۆغوونه ، ده نگی / ء / و / ع / له زۆربه ی زاره کانی کوردیدا هه ن وجێگه ی خۆشیـان ده گۆرنـه وه بێ ئه وه ی واتای وشه بگۆرن . ( هه ر له به ر ئه مه یه که م . توفیق ره هبی له قاموسه که یدا هه موو ئه و وشانه ی به ( / ء / یان / ع / ده ست پی ده که ن له یه ك شوێندا تۆماری کردوون ) . ب و غوونه ، گۆرینی / ع / بو / ء / یان به پێچه وانه وه کار ناکاته سه ر واتای ئه م وشانه ی خواره وه :

| | |
|---|---|
| عاسمان / ئاسمان | سوئال / سوعال |
| قورئان / قورعان | عم مر / ئه مر |

## ٢ ـ ئاستی ڕێزمان ( مۆرفۆلۆجی ووسیتاکس )

ڕێزمان هه ر وه ك ده نگه به تێپه ر بوونی كات ده گۆری ، هه ر چه نده ئه م گۆڕانه كه متر هه ستی پێ ده كرێ وكه ره سه ی ڕێزمانیش جیڕتره وكه متر خۆ به ده ست گۆرانه وه ، ده دات .

له ئاستی مۆرفۆلۆجیدا گۆران زیاتر له گره كدا ده رده كه وی ، به واتای ئه وه ی گره كی زمان زووتر له ره گه ده گۆڕی . دیسانه وه گوران له گه ردانه ی كار وله دارشتنی وشه دا ده بینری . بۆ نموونه ، هه ندی گره كی كوردی به تێپه ر بوونی كات له ناو چوون ( وه ك مورفیمی بچوكردنه وه ی / ك / كه له وشه ی (( كرمه ك )) دا وه ك پاشماوه یه ك ماوه ) . هه روه ها زاره كانی ناوه راست به پێچه وانه ی هه موو زاره كانی باكوره وه ، كۆمه له یه كی تری راناوی لكاویان په یدا كردووه كه له گه ڵ كرداری تیپه ردا له تاقی رابردودا به كاردێ ( وه ك له : خواردی ، خواردمان ، خواردتان ، خواردیان ، خواردت ، ........ هتد ده رده كه وی ) .

فه رهه نگی وشه ی زمان به رده وام له گۆراندایه . گۆرانی فه رهه نگی ده گه ڕێته وه بۆ چه ند هۆیه ك : ( ١ ) خواستن ( ٢ ) گۆرانی واتایی ( ٣ ) گۆڕانی له شێوه ی دارشتنی وشه دا . بۆ نموونه ، وشه ی (( ویژدان )) له عه ره بیه وه خوازراوه ، وشه ی (( پی )) به واتای (( په كه په كی پێوان )) له ئه نجامی گۆڕانی واتاییه وه هاتووه ووشه ی (( زانكۆش )) هه ر چه نده پارچه كانی كوردین له ئه نجامی گۆران له شێوه ی وشه دارشتنی كوردیدا په یدا بووه .

ئاسایی وشه ی نوی ، له كوردیدا به یه كێك له م ڕێگایانه ی خواره وه دا ده تاشری :

( ١ ) لێكدان : خستنه پال یه كتر وه ك : قژ زه رد ، په لكه زێرینه ( ٢ ) دارشتن : زیاد كردنی گره ك : ره نگین ، ئاسنین ، نه رمایی ..... هتد .

له م سالانه ی دواییدا كوردی دوو ڕێگای تریشی په یدا كردوو بۆ دارشتنی وشه : ( ١ ) به هۆی كرتاندن ولێكدانه وه : بۆ نموونه ، له داتاشینی وشه ی (( زانكو)) دا ئه م دوو كاره ئاشكرایه . ( وشه كه له كۆی زانینه وه وه رگیراوه له (( زانین )) ، وه (( زان )) وه رگیراوه ودوایی له گه ڵ (( كۆ)) دا لێكدراوه وپاش وپێشیان پێ كراوه ). ئه م ڕێگه یه ی دارشتن له وشه ی تریشدا به رچاو ده كه وێ وه ك : كۆ

زمانـه وانی ( کـۆمـه لنـاسی وزمـانـه وانی ) ، ( ۲ ) بـه هـوی ئـه کـرۆنیمـه وه که بریتی یه له لێکدانی برگه ی یه که می یان ده نگی یه که می دوو وشه یان زیاترو خویندنه وه ی یان به یه که وه یان وه ك ده نگی پیته کان ، نموونه : د . خ ( دال خاء ) = درودی خوای له سه ر بێ ، پ . ز ( پاء ، زاء ) = پێش زاین ، پ . ن ( پاء نوون ) = پێش نێوه رو . . . . . . . .

له ئاستی سینتاکسدا گۆران که متر روو ده دات وه ك له ئاسته کانی تر ، به لام دیسانه وه لێره شدا گۆران شتێکی ئاسـاییه وزۆر بـه دی ده کرێ . گـۆران له م ئاسته دا له چه ند شێوه یه کدا ده بینری وه ك گۆران له رێکه وتنی بکه ر وکاردا ، گۆران له شێوه ی ریز بوونی که ره سه کانی رسته دا وله ناو چوون یان په یدا بوونی ئامراز .

بۆ نموونه ، له کوردی ئه مرۆدا ( دیسانه وه زاره کانی ناوه راست ) ئه و کۆمه له راناوه لکاوه ی بۆ خۆیه تی به کاردێن وله گه ل تاقی رابردووی تێپه ردا ده رون نه ك هه ر گه شه ی نوێن به لکو خۆشیان لـه رسته دا ده خلیسکـێن ویه پێچـه وانه ی کومه له راناوه لکاوه که ی تره وه نه ك هه ر به ته نیا به کۆتایی کاره وه ده لکێن ، به لکو له رسته دا هه ولی پێشه وه ده ده ن ویه ناو وئاوه لکارو ئامراز وئاولناویشه وه ده لکێن . بۆ نموونه ، باله شوێنی راناوه که له م رستانه ی خواره وه دا ورد ببنه وه :

( ۱ ) زۆرم خوارد

( ۲ ) نانه که م خوارد

( ۳ ) پیاوه شێته که م دی

( ٤ ) خوار دم وهاتمه ده ره وه .

( ٥ ) پێم وت

( ٦ ) کی یه ؟ منم .

دیسانه وه له کوردی ئه مرۆدا رێکه وتنی بکه ر وکاریش گۆرانێکی تی که وتووه . بۆ نموونه ، له کوردی پێشتردا ناوی کۆ به دوای ژماره دا ( له یه ك زیاتر ) دی وکاره که ش ده کات به کۆ :

سه د که سان مردن .

له کوردی ئێسته دا ناوی دوای ژماره وکاره که ش به تاکی ده مێنێته وه

سه د که س مرد .

هه روه ها کوردی ئه مرو که متر ریّگه ده دات یاری به شویّنی کار بکـریّ :ـ
رسته دا . رسته یه کی وه ك :

١ ـ هه ر که سی سه رف بکا درهه میّك ( ل ١ )

٢ ـ ئیراده ی کردزاهیر بکا خه بری خه لقی خوّی .

٣ ـ نووریکی عه زیم داخلی بوو دلّم .

( مولود نامه )

له کوردی ئیّسته ماندا به ناپه سه ندو ناریز مانی داده نری .
شـایانی تیّبینی یـه که کـوردی نویّ ئـامرازیکی پـه یوه ستی کـوّنی فری داوه
وله جیّگه ی دا ئامرازی په یوه ستی (( بوّ . . . به کار دیّنی : ـ

به چوونی توّ ئه سه ر زه مینی . ( بوّ . . . . . . . . )

ئه خلّه و تخانه ی قابه قه وسینم بردووه ( بوّ . . . . . . . . )

( مولود نامه ل ٤٢ ول ٤٤ )

## ٣ ـ ئاستی سیمانتیکی :

گورانی واتاییش دیسانه وه رووکاریّکی دیاری کراوه له زوّربـه ی زمانـه کانی جیهاندا وه رده رُی ، به واتای ئه وه ی گوّرانی واتایی له چه ند شیّوه یه کدا له زمانه سروشتیه کاندا دوویات ده بیّته وه . گرنگترینی ئه م رووگارانه ی گوّران ئه مانه ن ( Pyles , Algeo , 225 - 30 ) :

أ ـ واتا ته سك بوونه وه : ـ

لیّره دا وشه یه ك واز له واتا گشتیه که ی خوّی دیّنی وپسپـوری له واتـایه کی ته سکتردا په یدا ده کات . له وانه شه وشـه که ی هـه ردوو واتاکـه ی بپاریـّزی له هه مان کاتدا به واتایه کی تر ، هه ندی جار واتایه کی گشتی هه بیّت وهه ندی جـاریش به واتـایه کی تـه سکتر بـه کار بیّت . بـوّ نموونـه ، وشه ی (( نـان )) له بنه ره تدا وه ك له هه ندی فریزدا ده رده کـه ویّ به واتـایه کی فـراوان به کـار هاتووه وهه موو جوّره خواردنیّکی گرتوّته وه ( نانی پی په یدا ناکریّ . به دوای ناندا ویّله ، نانی مه بره ، نانی خوّی ومندالّی بری . . . . . هتد ) ، ئیّسته شان به شانی ئه م واتا فراوانه ، وشه ی (( نان )) له کوردی ئه مروّدا به واتای (( کولیّره )) ش دی وه ك له م به کارهینانانه دا ده رده که وی : مناله که ی نارد نان بینی ، چووه نان

بکری ، دوونان له ماله دراوسیه که تان بێنه ، چێشت به نانه وه ناخوات ، نانه که له ت نه که ی ، ئه وانه مان بۆ ته ڕ بکه . . . . . . . . هتد . هه مان گۆڕان له وشه ی (( پیر )) دا به دی ده کرێ .

**ب ـ واتا فراوان بوون : ـ**

ئه م کاره پێچه وانه ی واتا ته سك بوونه وه یه . لێره دا وشه که به تێپه ڕبوونی کات واتایه کی فراوان تر په یدا ده کات ودیارده یه کی گه وره تر ده گرێته وه بۆ نموونه وشه ی (( بزوێن )) له بنه ره تدا به واتای (( له وه ڕگا )) هاتووه ئێسته واتاکه ی فراوانتر بووه و (( هه موو شتێکی پێویست )) ده گرێته وه . (عبدالرحمن زه بیحی ، ۱۹۷۹ ل ۹۱ ) .

**جـ ـ به رز بوونه وه ی واتا : ـ**

لێره دا وشه یه ك که له بنه ره تدا بارودوخیکی خراپی گه یاند بێت وازی له و واتایه ی هێناوه و واتایه کی باشتری وه رگرتووه . بۆ نموونه وشه ی (( شۆخ )) که ئێسته به واتای (( جوان )) دێت له قۆناغێکی پێشتردا به واتای (( بێ حه یا )) به کار هاتووه .

**د : نزم بوونه وه ی واتا :**

ئه مه ش پێچه وانه ی واتا به رز بوونه وه یه وکاتی ڕوووده دات که ووشه یه ك واز له واتایه کی باش یان بێ لایه ن بێنێ وواتایه ك وه رگری که سووکی ڕیسوایی بگه یه نی .

بۆ نموونه ، وشه ی بۆر که له ووشه ی بوره سوار و بۆره زه لام دا ده بێنری له بنه ره تدا له واتادا بێ لایه ن بووه ، به واتای ئه وه ی نه دۆخێکی خراپ ونه دۆخێکی باشی گه یاندووه . له کوردی ئه مڕۆدا واتای وشه که به ره و ڕیسوا بوون هاتووه چونکه ئه م وشه یه ئێسته به واتای مرۆڤێکی لات وبێ پاره وبێ به هاوبێ باوه ڕ دێت ( زه بیحی ، به رگی دووه م ، ل ۱۱۵ ) . هه مان گه شه له وشه ی عه یار به دی ده کرێ .

هه ر زۆر له ده مێکه وه زمانه وانه کان به دوای هۆی زمان گۆڕندا ده گه ڕێن وبۆ لێکدانه وه ی ئه م دیارده یه ده یان بیر دوزیان خستۆته ڕوو :

## ( ١ ) تیۆری وزه پاراستن ( یان وزه به فیرۆنه دان ) :

به پێ ی ئه م بیره هه موو ئه و گۆرانانه ی که له زماندا روو ده دات ده گه رێته وه بۆ ئه و ئاره زووه یه ی که له مرۆڤدا هه یه بۆ ئاسانکردنی ده ربرین ، به واتایه کی تر هه موو گۆرانێك به مه به ستی سووککردنی ئه و ئه رکه یه که ده که وێته سه رما سولکه کانی ئه نداماني ئاخاوتن . به م پێ یه هه موو ئه و گۆرانانه ی که له پێشتره وه باسمان کردوون ( تواندنه وه وکرتاندن وجیا بوونه وه وجێ گۆررکێ ویه رز بوونه وه و سووك بوونی واتا وگۆران له ریزبوونی که ره سه ی رسته و په یدا بوون ولێنلچوونی ئامراز . . . . هتد ) هۆ کارن بۆ که م کردنه وه ی ئه رکی ده ربرین . تواندنه وه وجێ گورکێ کرتاندن ، بۆ نموونه ، زیاتر ئه و هێشووه ده نگانه که رت ده که ن له و ده نگانه رزگارمان ده که ن که قورسن و قه به ن ویه ئاسانی بۆمان ده رناهێنرێن . بێ گومان ، ئاسانی وگرانی ده نگه ده رهێنان شتێکی وه ها ( مطلق ) نی یه و له زمانێکه وه بۆ زمانیکی تر ده گۆری و ئه و هێشووه ده نگه ی له کوردیدا قورسه له وانه یه له زمانیکی ترداوا دا نه نرێ ئه م بیردوزه له لایه ن زیف و تینی وکبورتسه وه په سه ند کراو ن یه لگه شیان بۆراستی بیره که له وه دایه که ( ١ ) زمانه کانی ئه مرۆ له قوناغه کانی پێشتریان ئاسانترن بۆ درکاندن ( ٢ ) هه ندی گۆران به هۆی ئه م بیردۆزه وه چاك لێك ده درێته وه .

## ٢ ) تیۆره ره که ی مارتنیت :

به باوه ری زمانه وانی فه ره نسی مارتنیت هه موو زمانیك له گه ل په یدا بوونیا هۆ کاری گۆرانی له گه ڵدایه چونکه هه موویان ئه و ئاره زویان تێدایه که ئاسان بن وئه رکێکی زۆر نه خه نه سه ر ئه و که سانه ی که قسه یان پی ده که ن و به کاریان ده هێنن . جا له به ر ئه وه ی زمانیشی ناریکی زۆری تێدایه و ئه م دیارده نا ئاوێزانه ش تا راده یه ك زمانیان لاسه نگه کردووه ، قسه که ران هه میشه به دوای هێنانه وه ی هاو سه نگیه وه وێلن وهه موو ئه و گۆرانانه ی دێته کایه وه بۆ ئه م مه به سته ته رخان ده کرێ . بێ گومان ئه م ئامانجه ی قسه که ران هه رگیزنایه ته دی چونکه هێنانه وه ی هاوسه نگی له لایه ك ده بێته هۆی لاسه نگی له لایه کی تری زمانه که . به م جۆره کێشه که به رده وام ده بێت و زمان وگۆران شان به شانی یه کتر ده رۆن وته نیا کاتێك زمان له گۆران ده که وێت که له ناو چێت

## ٣ ) تیۆری زمانی دایك :

به پێ ی ئه م بۆ چوونه گۆرانی زمان ده گه رێته وه بۆ کاری دوو زمان یـان زیاتـر له سه ر یه کتری . ئه وانه ی فێری زمانێکی بێگانه ده بن ، ئاسایی به ر له مه ش زمانی دایکی خۆیان ده زانین . ئینجا یان زمانی دووه م به ، ته واوی فێرنابن یان زمانه که ی خۆیان ده گۆرێ . له هه ردووباره که دا زمان گۆران دێته کایه وه . له گه ڵ ئه وه شدا که به ڵگه ی مێژووی زۆره بۆ دووپاتی ئه م بیردۆزه ( وه ك ئه و گۆرانانه ی که به سه ر ئینگلیزیدا هاتووه له هیندستان ، له ئه مه ریکا وئه فریقا ) ئاشکرایه که بیردۆزه که هه موو جۆره گورانێکمان بۆلێك ناداته وه .

## ٤ ) تیۆری رووداوی مێژوویی وکۆمه لایه تی :

به شێ زمانه وان زمان گۆران ده ده نه پاڵ رووداوی مێژ وویی وکۆمه لایه تی وه ك شه ڕ وجه نگی به ربلاو داگیر کردن وبرسیتی ونه خـۆشی وکۆچ وبـارکردن وباری نائاسایی ونوێ کردنه وه و ئاو دانکردنه وه ی ولات . ئاشکرایـه که هـه ر یه کی له م دیاردانه ده بێته هۆی زمان گۆران ، به لام دیسانه وه ئه م دیاردانه هه موو گۆرانێکمان بۆ لێك نادا نه وه .

هه ر یه که له و بیردۆزانه ی سه ره وه لایه نیکی گۆرامان بۆ لێك ده ده نه وه دووپاتی ئه م لایه نه ده که ن ، به لام له به ر ئه وه ی گۆران کارێکی ئالۆزه وزیاتر له هۆیه ك ،ده‌یهێنێته دی ، هیچ کام له م تیورانه به ته نیا دیارده که لێك ناده نه وه .

زمان گۆران ده گه رێته وه بۆ دوو کۆمه ڵ هۆ : ( ١ ) ئه و هۆیانه ی به ندن به باری کۆمه لایه تیه وه ( باری ئه و که سانه ی که زمانه که به کارد ێنێت

## ( ٢ ) ئه و هۆیانه ی به ندن به زمانه وه .

أ ـ هۆی کۆمه لایه تی که بریتی یه له : ـ

١ . کارتێکردنی زمانی نوی یان دایلێکتی تری زمانه که به هـۆی تێکه لاوی قسـه که رانه وه . لێك که وتنی دووزمان یان دوو زاری زمانێك ده بێته هۆی خواستن که کارده کاته سه ر هه موو ئاسته کانی زمانه که و ده بێته هۆی زمان گۆران .

٢ . هـۆی جوگـرافی که بـه تایبـه تی ده ور ده بینێت له دروستکـردنی زاری جۆر به جۆردا .

٣ . ئه و ئاره زووه ی که له مرۆڤدا هه یه بۆ داتاشینی وشه و ده نگ و رسته له
نموونه ی پێشتردا .

٤ . ئه و ئاره زووه ی که له مرۆڤدا هه یه بۆ گه یاندنی واتا یان مه به ست به رووز
ئاسانی وخێرایی وکورتی وبه هۆی که مترین وزه وه .

ب ـ هۆی زمانی : ـ

ئه م هۆیانه راسته خۆ ده بنـه هۆی گـۆران له ئـاستی ده نگداو ( فـۆنه تیـك
وفۆنۆلۆجی ) ئاسایی ده کرێن به دوو به شه وه : ـ

١ . هۆی فه سله جی که ده گه رێته وه بۆ هه ڵکه وتی مرۆڤ و وئه نداماني ئاخاوتن
. ئه مه ش له دوو باردا ده رده که وی :

أ . بیستنی ده نگه کانی‌بوونه وه یان هه رگیز وه ك یـه ك نابن تـه نانـه ت ئه گـه ر
ده نگـه کانیش لـه هه مـان کاتـدا وله لایـه ن یه ك کـه سیشه وه بـۆ ترێنـه وه ،
به واتایه کی تر ده هێنانی ده نگه که هه ر جاره به جورێك ده بێ و هه موو جاری
جیاواز ده بێ له جاره کانی پێشوو تر .

ب . ئاماوه یه کی زۆرتر به سه ر وتنه وه ی ده نگیکدا نیه ر بیت ، وتنه وه که زیاتر
له ده نگه بنچینه که دوور ده که ویته وه وجیاواز تر ده بێت . به م جۆره گۆران له
ئاستی ده نگدا بریتی ده بێ له سه رابای ئه م جیاوازییه وردانه که جارله دوای جار
زیاد ده کات تاوای لێ دێ به زه قی ده رده که وی وبێ به کارهێنانی ئامێر هه ستی پێ
ده کرێ .

٢ . هـۆی ده رووفی کـه ده گـه رێتـه وه بـۆ رێـك نـه کـه وتنی بـزاوتنی مێشـك
وفه رمانه کانی له گه ل بزوتنه وه ی ماسولکه کان ئه ندامی ئاخاوتندا . بۆ نموونه و
له ده رهێنانی وشه یه کی وه ك(کیێ)دا ئاماسولکه کانی ده م وقورگ ده جولێنه وه بۆ
ده رهێنـانی وده ربرینی ده نگی / ك /،مێشـك فه رمـانی ده نگی / ی / یش ،
ده رده کات . به مه مێشك مـاسولکـه کان نـا چار ده کـات که پـه له بکـه ن له
ئه نجامی ئه م په له پرووزییه دا ئه و ده نگه ی که ده رده برێ جوۆرێك ده بێ له / ك
/ . ( ك / ی نه رم که له ده نگی / چ / وه نزیکه ) . زۆر به ی ئـه وگۆرانـه
ده نگیانه ی که له زماندا رووده ده ن وه ك تواندنه وه کرتـاندن و دروست بـوونی
ده نگی نوێ و جێ گورکێ وبه ر لووت دان وبه ر نه رمایی دان . . هتد ده ڕێنه

پال ئه م هۆ ده روونی یه كه له ئه نجامی ریك نه كه وتنی جوولانه وه ی مێشك وبزووتنه وه ی ماسولكه كانی ئه ندامی ئاخافتندا دێته كایه وه .

**خواستن : ـ**

مه به ست له خواستن هه لگرتنه وه و به كار هێنانی ئه و كه ره سه زمانیانه یه كه له زمانێك یان زارێكی تردا بینرا بن ، ( لێره دا كه ره سه ی زمانی نه ك هه رفۆرم به لكو واتاش ده گرێته وه )

خواستن كاتی دێته كایه وه كه دووزمان ( یان زیاتر ) له یه ك قسه كه ر داگرد بنه وه (به هۆی كه سیكه وه كه به لای كه مه وه له دوو زماندا شاره زا بی ) یان كاتێك دوو زمان یان زیاتر له یه ك شوێندا به كاربێن . له بارو دۆخی وادا یه كێك له م زمانانه له رووی كۆمه لایه تیه وه پایه یه كی به رزی ده دریتێ یان له به ر ئه وه ی زمانی كار به ده ستانه ( بۆ نموونه ، زمانی كار به ده سته كۆلۆنیسته ئنگلیزی و فه ره نسیه كان له ئاسیاو ئه فریقیادا ) یان له به ر ئه وه ی زمانی زۆربه ی خه لكی ناوچه كه یه یان له به ر ئه وه ی میراتیكی ناو كوێی پی تۆماركراوه . ئاشكرایه كه ئه م زمانانه هه موویان له رووی كومه لایه تیه وه پی تۆمار كراوه . ئاشكرایه كه ئه م زمانانه هه موویان له رووی كومه لایه تیه وه یه ك گرنگی یان نابێ وبه یه ك چاو سه یر ناكرێن له لایه ن خه لكه وه ته نانه ت ئه گه ر یاسای ولاته كه ش وه ك یه ك سه یریان بكات . ئه م پله وپایه كۆمه لایه تیه رووكاری خواستن دیاری ده كات وكه ره سه ی زمانه پایه داره كه وه ، ده چێته ناو زمانه كانی تره وه وئه م ده كه وێته ژێر كاریه وه . تاقسه كه ریش به م زمانانه كه مترین كاری زمانه پایه داره كه توند ترو به هێز تر ده بی . زمانه به رزه كه خوی كه ره سه زۆر كه م ده خوازێ وناكه وێته ژێر كاری زمانه دراوسیه كانیه وه و زۆربه ی ئه وانه ی كه دوو زمان یان زیاتر فێر ده بن له قسه پێكه رانی زمانه ناو چه یییه كه ن نه ك زمانه به رزه كه .

هه ندی جار هۆ كاری وا دێته پێشه وه كه ئه م رووكاره ئاسابیه ی خواستن وكار لێكردنه تێك ده دات وته نانه ت پێچه وانه شی ده كات . یه كێك له م هۆ كاره گرنگانه ژماره ی قسه پێكه رانی زمانه ناوچه ییه كه یه . ئه گه ر ژماره ی ئه مانه زۆر زیاتر بێت له ژماره ی ئه و كه سانه ی زمانه به رزه كه له كاربارياندا به كاردێنن ،

ئه وا زمانه ناو چه یيه كه كار زياتر ده كاته سه ر زمانه به رزه كه و ده يشێوينى هه ر چه نده كه ره سه ى زمانه به رزه كه بۆ زمانه ناو چه ییه كه وه بۆ نموونه له هيندستان ، له به ر ئه وه ى قسه كه ران به زمانى ئور دوو زۆر زياتر بوون له ژماره ى ئه وانه ى به زمانى ئينگليزى ده دوان ، ده بينين زمانى ئينگليزى له گه ل ئه وه شدا كه به رز تر وپايه دارتر بوو كه وته ژێركارى ئوردوو وتا راده يه ك شێوا .

به پيچه وانه ى ئه مه شه وه ، زمانى ئينگليزى له ولاته يكگرتوكانى ئه مريكا كارى ئه واوى كردۆته سه ر زمانه هيندۆ ئه مريكيكان بى ئه وه ى خۆى گۆرانيكى به سه ردا هاتبيت جگه له خواستنى هه ندى وشه له م زمانه ناوچه ييانه وه هه رچه نده خواستن له هه موو ئاسته كاندا روو ده دات ، راده ى توندو تيژى دياره كه له ئاستيكه وه بۆ ئاستيكى تر ده گۆرى :

## ١ . خواستن له ئاستى فونولۆجيدا :

به پيچه وانه ى فۆرم خواستنه وه ، خواستن له ئاستى فۆنۆلۆجيدا زۆركه م هه ستى پى ده كرى ، هه رچه نده ، دياره كه هه يه و ناويه ناو روو ده دات . كارى ده نگه خواستن له دووباردا ئاشكرا ده بى : ( ١ ) كه خواستن ده بيته هۆى په يدا بوونى فۆنيميكى نوى له زمانه ناوچه ييه كه دا . ئه مه ش كاتى دروست ده بى كه ژماره يه كى زۆر له فۆرم كه هه لگرى فونيميكى نامۆبن ، خۆيان بكه ن به زمانه قه رزاره كه دا . ده توانين په يدا بوونى ده نگى / ص / و / ط / و / ظ / له هه ندى له زاره كانى سه رووى كورديدا بده ينه پال ئه م دياره يه . به واتايه كى تر . سه ره هه لدانى ئه م ده نگانه له و زارانه دا له ئه نجامى هه لگرتنه وه وخواستنى ژماره يه كى زۆرى وشه ى زمانى عه ره بى يه كه ئه م ده نگه نامۆيه يان تيدايه ديسان به په يدا بوونى ده نگى / ط / له هه ندى له زاره كانى ناوه راستداكه له ده ربرينى هه ندى وشه ى وه ك طوز و طاسه دا له قسه ى چه نده كه سانيكدا ده رده كه وى ده گه ريته وه بۆ خواستنى ئه م وشانه به ده نگى / ط / ى نامۆوه . ئه م ده نگى / ط / ، كه له گه ل وشه ى عه ره بيدا خۆى كردوه به كورديدا ده بى ئيكه ل نه كرى له گه ل ئه لۆفونيكى ده نگى / ت / ى كورديداكه ديسانه وه له / ط / ى عه ره بيه وه نزيكه به لام له ئه نجامى گرد بوونه وه ى ده نگى / ت /

له گه ل ده نگی / ر / و / لِ / دا په یدا بووه(بروانه چونیه تی ده ربرینی ده نگی / ت / له وشه ی تاڵ و تالاو و ته ڕو ته ڕاودا . ) ( ٢ ) که خواستنی فۆرم ده بێته هۆی دیسانه په یدا بوونی ده نگی / ط / له هه ندی له زاره کانی ناوه راسداکه له ده ربرینی هه ندی وشه ی وه ك طوز و طاسه داله قسه ی چه ند که سانیکدا ده رده که وی د. گه ریته وه بۆ خواستنی ئه م وشانه به ده نگی / ط / ی ئامۆوه .

ئه م ده نگی / ط / ، که له گه ل وشه ی عه ره بیدا خۆی کردوه به کوردیدا ده بێ تیکه ل نه کری له گه ل ئه لۆفونیکی ده نگی / ت / ی کوردیدا که دیسانه وه له / ط / ی عه ره بیه وه نزیکه به لام له ئه نجامی گرد بوونه وه ی ده نگی / ت / له گه ل ده نگی / ر / ل / دا په یدا بووه بروانه چونیه تی ده ربرینی ده نگی / ت / له وشه ی تاڵ ته ڕ و ته ڕاو دا . ) ( ٢ ) که خواستنی فۆرم ده بێته هۆی گورانی چۆنیه تی ریزبوون و به دوا هاتنی فونیمه کانی زمانێك . بۆ نموونه هه ڵگرتنه وه ی ئه و فۆرمانه ی که ده نگی / خ / یان / غ / یان تێدایه له زمانه کانی دراوسیه وه بوته هۆی هه ڵوه شاندنه وه ی دا به ش بوونی ئه م دوو ده نگه له زاری سلێمانیدا . تاماوه یه کی زور ئه م دوو ده نگه جێگه ی خۆیان ده گۆرییه وه بێ ئه وه ی واتای وشه بگۆرن . تا ئیستاش ئه م دیارده یه له ناوه راست و کۆتایی وشه دا تاراده یه کی زۆر به رده وامه ( بروانه باخ / باغ / وه جاخ / وه جاغ ، ناخچه ، باغچه . . . . هتد ) . به لام دوو ده نگ بوونه ته دوو فۆنیس جیاواز ( بروانه غار / خار ( درك ) ) . به م پێ یه خواستنی وشه یه کـه م جار دابه ش بوونه دێر ینه که ی هه ڵوه شاندوته وه و له دواییدا ده نگی / خ / و / غ / ـ ی له یه کتر ترازندووه .

## ٢ . فۆرم خواستن :

فۆرم خواستن له خواستنی هه موو که ره سه کانی تر بلاو تره وله هه موشیان زیاتر هه ستی پێ ده کرێ وسه رنج راده کێشی . فۆرم هه لگرتنه وه ده گه رێته وه بۆ چه ند هۆیه ك :

١ ) پێوستی به وشه ی نوی به هۆی داهاتنی چه ملك ودیارده ی نوی وه یان به هۆی پێش که وتنی ته کنۆلۆجیه وه . ٢ ) لاسایی کردنه وه ی زمانه پایه داره که له لایه ن قسه پێکه رانی زمانی نزمه که وه بۆ خۆده رخستن یان بۆ خۆبردنه پێشه وه یان بۆ به رز

کردنه وه ی پله و پایه ی کۆمه ڵایه تی یان بۆ ده ست خستنی ئه و مافه زیادانه ی که به نده به زانینی زمانه به رزه که وه .
له به ر ئه وه ی فۆرم خواستن زیاتر له خواستنی ده نگ وریزمان وواتا هه ستی پی ده کری وله به ر ئه وه ی خواستن به گشتی هه ندی جار به دیارده یه کی خراپ وپر زیان لێك ده درێته وه فۆرم هـه ڵگرتنـه وه زۆر جار لـه لایه ن بـه تی خوازانـه وه به رهه ڵستی ده کری وهه ندی هۆکاریش ئه م به ر هه ڵستی کردنه توند وتیـژتر ده کات . له م هۆکارانه :
١ ـ هه ستی نه ته وایه تی ته سك کـه وا له خـه ڵکی ده کات بـاوه ربه وه بکـه ن که خواستن له پاکی یان به تینی زمـان که م ده کـاته وه و ده یخـاته گێـژاو تووشی مه ترسی له ناو چوون وتێکدانی ده کات . ئه م هه سته زیاتر به تی خوازه کان بلاوی ده که نه وه وبه هه ڵه له خه ڵکی ده گه یه نن
٢ ـ هه ستی دوژمنایه تی وناحه زی ونه یاری به رامبه ر زمانه به رزه که خۆی یان به رامبه ر ئه وانه ی قسه ی پی ده که ن .
٣ ـ ناجیاوازی دووزمانه که له رووی ریزمان وفۆنۆلۆجی ومۆرفۆلۆجیه وه زیاتر بێت خواستن که متر ده بێ چونکه که ره سه خواز راوه که له گه ل وشه بنه ره تیه کانی زمانه که دا ناروات وبه نامویی ده بنێته وه تافری ده دری .
٤ ـ دووری ئه و که لچه رانه ی که دوو زمانه که یان تێدا به کاردێ . دیسـانه وه ئاسه و باری رۆشنبیرییه ی که دوو زمانه که کاری تێدا ده که ن جیاوازین له یه کتری ، دیارده ی فۆرم خواستن که متر روو ده دات وبه پێچه وانه شه وه .
ئه و لێکوڵینه وانه ی له م دواییه دا ده رباره ی خواستن کراون چه ند راستیه کی خستۆته روو که پێویستیان به تێبینی کردنه وه ك : ـ
١ ) وشه زیاتر له هه موو که ره سه کـانی تره ده خـوازری ، ده نگ وکـه ره سه ی ریزمانی که متر هه ڵ ده گیرینه وه . خواستنی وشـه ی ساده ش لێکـدراو وفریـز بلاوتره .
٢ ) له وشه شدا ناو زیاتر له به شه کانی تری ئاخاوتن ده خوازری .
٣ ) راده ی خواستن له شێوازیکی زمانه وه بۆ شێوه یه کی تری ده گۆری ، بۆ نموونه که ره سه ی خوازراو له شێوازی قسه کـرندا زیـاتر بـه کاردێ لـه کوردیـدا وه ك له شێوازی نووسین ( ٤ ) هه روه ها خـواستن له هـه ندی بـابه تـدا ئاشکـراتره

وفراوانتره وه ك له بابه تيكى تر . بۆ نموونه ئه و وشانه ى كه ده رباره ى ئايين ودينن وله عه ره بيه وه خۆيان كردووه به ناو زمانى كورديدا زۆر له و وشانه زياترن كه لهمان سه رچاوه وه هاتوون وده رباره ى خواردن يان كه ل وبه لسن ( ٥ ) زۆربه ى ئه و فۆرمانه ى كه له زمانيكه وه ده خزينه زمانى تره وه تيك ده شكين وتيك ده چن وهه ندى له تايبه تيه ده نگيه كانيان ده تويته وه به جۆريك كه هه ندى جار سه رچاوه كه يان ون ده كه ن . بۆ نموونه ته نيا ليكولينه وه ى وردو دريژ ده توانى وشه يه كى وه ك ئافره ت يان شه ل يان ته قنه ى فه قى بگيريته وه وه بۆ سه ر چاوه عه ره بيه كانيان كه عوره وأشل و دخل الفقيه ن . ( ٦ ) زۆر گرانه بتوانين بربار بده ين له كه يدا وشه يه كى خوازراو له وه ده كه وىَ بيگانه بىَ و وه ك بيگانه هه لس و كه وه ت بكات يان له كه يدا ده بىَ به مولكى زمانه نويه كه و وه ك وشه ى خومالى لىَ دىَ . به واتايه كى تر ، زمان به هۆى وشه كانيه وه ناناسرينه وه ووشه نابيته نيشانه بۆ زمان ، به لكو ريزمان وبۆ ته ى ريزمان ( كه ئاسايى به ر هه لستى هه موو جۆره دياره ده يه كى خواستن ده كه ن ) زمانيك له زمانيكى تر جيا ده كه نه وه . بۆ نموونه ، ئه گه ر هه موو كه ره سه كانى رسته يه كى كوردى له زمانيكى تره وه بخوازين ، هيشتا رسته كه هه ربه هى كوردى ده ژميرى چونكه بۆ ته ريز مانيه كه كورديه وبه رهه مى كه شه ى شيوه يه كى پيشوو ترى زمانى كورديه كه به ئاسانى به يه كتره وه گرىَ ده درين ( ٧ ) فۆرم خواستن له زمانى تره وه له گه ل نى يه به زمانه وه و به هيچ جۆرى نابىَ له ريزى كه م بكاته وه چونكه خواستن له راستيدا نيشانه ى زيندويى زمانه كه يه وله پال ريگه ى تردا ( وه ك وشه ليكدان ووشه دا تاشين ) وا له زمان ده كات كه بتوانىَ له گه ل پيش كه وتنى تيكنولوجىدا ده رچىَ ولىَ ى دوا نه كه وى ( ٨ ) چه نديتى فۆرمخواستن په يوه ندى به رۆنانى دوو زمانه كه وه نى يه ( وه ك تا ئه م منالانه ى دواييش باوه ر وا بوو ) به لكو به نده به بارى كۆمه لايه تى وروشنبيرى دوو زمانه كه وه بۆ نموون ، كوردى و عه ره بى له رۆناندا ته واو جياوازن به لام باره كۆمه لايه تى و روشنبيريه كه واى كردووه كه كوردى ژماره يه كى زۆر وشه ى عه ره بى بخوازى بى گوى دانه جياوازى نيوان دوو زمانه كه . به لگه يه كى تريش بۆ ئه م باوه ره كارى زمانى ئينگليزى يه له سه ر زمانه ئه فريقايه كان . ئه م زمانانه له گه ل ئه وه شدا كه له رۆناندا ته واو له ئينگليزى جياوازن ژماره يه كى يه كجار زۆريان

له ئینگلیزیه وه وه رگرتووه له ژێر کاری باری روشنبیری وکۆمه ڵایه تیدا . ( ٩ )
هه ر چه نده دیارده یی خـواستن زۆربه ی کـات بۆ پـرکردنـه وه ی ئه و کـه ڵینه وشه بیانه یه که که له زمانه قه رزاره که دا ده رده که وی ، هه ندی جار فۆرمی وا خۆی ده کات به زمانیکدا که به رامبه رێکی چه سپاوی هه یه له زمانه که دا . بۆ نموونه ، له گه ڵ ئه وه شدا که کوردی وشه ی (( چیا )) و (( شاخ )) تیری هه یه ، هه ندی زار وشه ی (( جبل )) ی عه ره بی بۆ ده ربرینی هه مان دیارده به کاردێنی .
( ١٠ ) بازدان له زمانێکه وه بۆ زمانێکی تر له کاتی قسه کردندا یان فۆرم خواستن به شێوه یه کی به ربڵاو له کاتی ئاخاوتندایه شێوازێکی ناره سی دیارده یه کی زور بلاوه به تایبه تی له و ناوچانه دا که زمانه سه رچاوه که ده سه لاتیکی روشنبیری گه وره یه ی هه یه وقسه که ران به زمانه قه رزاره که مه ترسی ئه وه یان لێ ده کری هه ویه ی که سی خۆیان بدۆرێنن .
فۆرم خواستن چه ند شێوه یه کی جیاواز وه رده گری . هه ندی جار فۆرمه که له شێوه ی وشه یه کی سـاده دا ده بێ ( وه ك : حه ج ، زه کـات ، مه کتـه ب ...... هتد ) هه ندی جاریش له شێوه ی وشه یه کی لێکدراودا . ( وه ك : عید میلاد ...... ) جاری واش هه یه له شێوه ی فرێز یان رسته ی ته واو ده بێ ( وه ك : سه لام وعه له یکم ، ته شه کور ، ) زۆربه ی کات فۆرم خواستن له شێوه ی وشـه یه کی تێکـه ڵدایـه ، به واتـای ئه وه ی کـه رتێکی وشه کـه ( ریشـه یـان گره که که ی ) خۆماڵی ده بێ وکه رته که ی تـری خوازراو وه ك لـه م نموونـانه دا ده رده که وی : -

أ - ریشه ی خۆماڵی + پاشکری خوازراو : نووسه ر ، ( تیپ ) رێکخه ر
ب - ریشه ی خوازراو + پاشکری خۆماڵی : رۆمانی ، بیرو کراتی بۆرژاوه یه تی ، گالونیك ( نه وت ) ، کۆنفرانسێك
جـ - وشه ی خوازراو + وشه یه کی خۆماڵی : ڤۆلتیه به رز ، کبریتیدی ئاسن
د - وشه ی خوازراو + وشه ی خوازراو : هیندو ئه ورویی ، ئه فرو ئاسیاوی

**٣ - واتا خواستن : -**

---

خواستن ته نیا له فۆرم وده نگه وریزماندا روو نادات ، به ڵکو زۆر جار

واتاش له زمانێکه وه خۆی ده کات به زمانێکی تردا . واتا خواستن له دوو شێوه ی جیاوازدا ده بینری : -

( هه ندی جار واتا بۆ فۆرمیك ده خوازرێ که خۆی له زمانه که دا هه یه به واتای ئه وه ی فۆرمه که خۆمالیه ، بۆ نموونه وشه ی (( پێ )) هه ر له ده مێکه وه له کوردی دا به واتای (( قاچ )) هاتووه . له م نیوه سه ده یه ی دواییدا له ژیرکاری زمانی تردا ، واتایه کی تریشی خواستوه و له بیرکاریدا به واتای (( دانه یه کی پێوان )) به کاردی . هه روه ها وشه ی (( گری )) که له بنه ره تدا هه ر به واته ی (( گری )) دار هاتووه ، ئێسته که له بیرکاریدا به واتای (( دانه یه کی )) پێوان دی له ژێرکاری زمانی عه ره بی دا . له به ر ئه وه ی ئه م دوو واتایه ی ئه م جۆره وشانه په یوه ندییان به یه کتره وه نی یه ، له فه رهه نگدا وشه یه کی وه ك (( پی )) و (( گری )) دوو جار ده نوسرێت وهه ر جاره واتایه کی ده دری به م جۆره ی خواره وه:

پێ[1] (غ) = قاچ

پێ[2] = ( دانه یه کی پێوان )

به واتایه کی تر ، واتا خواستن بۆ وشه ی خۆماڵی ده بێته هۆی دروست بوونی هوموفون ( ئه و فۆرمانه ی که له شێوه دا یه کن وواتاییان جیاوازه ) .

٢ ) زوربه ی جار واتا خواستن به هۆی وه رگیرانی فۆرمێکی بێگانه وه ده خرێته ناو زمانێکی تره وه . هه ر چه نده به م پی یه ش زور جار واتا یه ك بۆ فۆرمه که ده خوازری ، به لاّم به وه له شێوه ی یه که م جیا ده بێته وه که نابێته هۆی دروستکردنی هوموفون ( هاو پیت / هاوشێوه ) ، چونکه دوو واتاکه ( ئه گه ر جیاوازیش بن ) هه ر په یوه ندییان به یه که وه ده بێ ویه کێکیان به گه شه یه کی واتای ئه ویتریان ده ژمیرێ . بۆ نموونه ، وه رگێرانی فریزێکی وه ك (( علی الاقل )) له عه ره بیه وه بۆ کوردی ئه گه ر که مێکیش له واتای (( که م )) بگۆری هێشتا به ته واوی له (( که م )) ی بنه ره تی ناترازێنی ووای لی ناکات به دوو وشه ی جیاواز دابنرێ . نموونه ی تر له شێوه ی دووه م : مختصر = کورته ، شعور بالنقص = هه ست به که مێتی ، علی ضوء = له به ر رۆشنایی ، قبل کل شیی = به ر له هه موو شتێك ، مکتب = نوسیگا . . . . . . . . هتد .

## ٤ ـ خواستنی که ره سه ی ریّزمان : ـ

هه ر چه نده ریّزمان که متر له دیارده زمانیه کانی تر ده که ویّته ژیّر کاری زمانی تره وه وکه ره سه ی ریّزمانی خواستن که متر باوه ته نانه ت ئـه م دیاردانـه ش ناو به ناو له ئه نجامی تیّکه لاّوی زوّردا له زمانیّکه وه ده که ونه زمانیّکی تر . خواستنی ریّزمانی له چه ند شیّوه یه کدا ده بیّ :

١ ) له ژیّر کاری زمانی تردا هه ندی جار وشه له هاوشانه ئاساییه کانی خوّی جیا ده بیّته وه وخوّی ده کات به ده ورو به ری جیاوازدا وه ك ئه م ئاوه لّناوه کوردییانه : سلاّویّکی شورشگیّرانه ، وشه ی بیّ تاوان ،

٢ ) هه ندی جار زمانه سه رچاوه که بوّته ی ئاماده کراو ده خاته ناو زمانی تره وه . بوّ نموونه ، کوردی ئه م بوّته ریّزمانیه ی خواره وه ی له عه ره بیه وه خواستووه .

( کار + به + ناو )

هه ست به ئاهه نگیّك / شاییه ك

به زمیّك / سه یرانیّك

که له جیاتی بوّته ئاساییه که ی خوّی یان شان به شانی ئه و به کاردیّنی :

ناو + کار

شاییه کمان کرد

سه یرانیّکیان ری خست

ئاهه نگیّکیان گیّرا

٣ ) په یدا بوونی هه ندی پاشگری نویّ یان به کـارهیّنانی پاشگره کـوّنه کـان له ده وروبه ری نویّدا هه ندی جار ده دریّته پالّ کاری زمانی تر بوّنموونه ، پاشگری ( ـ نه / نا ) ی کوردی ئاساییی ده چیّته بیش ئاولّناو وواتا هه لّ ده گیّریّته وه ، به لاّم له م دواییدا له ژیّر کاری زمانی تردا ، ئه م پاشگرانه له پیش ناویشه وه ده بینریّن : ـ

نامروّڤایه تی ، = ( اللاانسانية )

/ ناحه زیّتی = العداء

وه ك له م نمونانه ی سه ره وه دا بوّمان ده رده که وی خواستنی ریّزمـانی له چـوار پیّوه یه کی ته سکدا رووده دات وبه ده گمه ن کارده کاته زمانه که هه موی . ئه م

راستیه له ده مێکه وه زانراوه وزمانه وانێکی وه ك ولیه م دوایت وتینی هه ر له سالی ١٨٨١ وه هه ولّی ئه وه ی داوه که ره سه ی زمانی به پێی ئاره زووی خواستیان رێز بکات ( Haugen , 71 ) . ناو له پێش هه موو که ره سه یه که وه دی ، به دوایدا به شه کانی تری ئا خاوتن وئینجا گره ك وده نگ ورێزمان . وێتنی دان به وه دا ده نێ که ده نگ وکه ره سه ی رێزمانیش ده خوازرین به لاّم له م باوه ره دایه که خواستیان ئاسایی نی یه وهه رگیز خۆ ناده ن له شانی خواستنی وشه . ئه مش به لای زمانه وانه وه شتێکی سه یر نی یه چونکه رێزمان که ره سه یه کی مادی ته واو نی یه و هه رچی شتێکش په یوه ندی به رۆ نانه وه هه بێ سه رکێشه و به رهه لّستی هه موو جۆره که ره سه یه کی مادی نامۆده کات له لایه کی ریشه وه که ره سه ی رێزمانی رێگابه خواستن که م ده دات چونکه ئه مانه ، ( به پیچه وانه ی وشه وه که کۆمه له یه کی کراوه ن وتاکۆتایی ژیان هه رله په ره سه ند نداان ) ، هه ر له منالّیه وه فێریان ده بین وده چه سپین وده بن به ره وشتێك که بێ ئاگاین لێیان . تاتا یه تیه کی زمان زیاتر بچه سبێن وبێته خۆیه کی بێ ئاگا ، ئه و تایبه تیه که متر ده گۆری وکه مترتێکه لّ به که ره سه ی نامۆده بی .

لێره دا پرسیارێك دێته ئاراوه ئه ویش ئه وه یه ئایا هه موو زمانه سروشتیه کان وه ك یه ك ئاره زووی که ره سه ی خواستن ده که ن ویه لایانه وه په سه نده ، ئاره زووی خواستن له زمانێکه وه بۆ زمانیکی تر ده گۆرێ ؟ ئاشکرایه که زمانێکی وه ك ئینگلیزی یان کوردی وشه ی زمانی تریان زور هه لّگرتوته وه له کاتێکدا که زمانێکی وه ك ئه لّمانی ئا ره زووی خواستنی زۆرکه مه وزیاتر به لێکدانی که ره سه ی خۆمالّی ده یه وێ که لێنه کانی بگرێ . هه ندی زمانه وان ئه م ئاره زووی خواسانه ده ده نه پالّ لێکچونی رێك که وتنی فۆرمه کانی زمان ( تجانس المفردات . بۆنموونه ، ئوتوکارفوکادلو (( Haugen , p . 79 )) له سالی ١٩٣٨ دا له لێکولینه وه یه کیدا ده رباره ی زمانی تێکه ل به پی ی خواستن به سه ند کردنی زمانه کانی جیهان ده کات به سێ به شه وه ( ١ ) ساز و ( ٢ ) نه ساز و ( ٣ ) تێکه ل . ئه وه ی له نرخی لێکولینه وه و پێزلینه که ی فوکادلو که م ده کاته وه ئاره زووی په تی خوازی خۆ یه تی . که ناهێلێت ده رکه وی له خواستندا کام هۆ کار گرنگتره ، هۆ کاری کۆمه لاّیه تی یان ئه و هۆکارانه ی په یوه ندییان به رۆنانی زمانه وه هه یه .

## فۆنۆلۆجی که ره سه ی خوازراو ( خوازه ) :

بلاوترین وساده ترین گۆڕان که به سه ر که ره سه یه کی خوازراودا دێ ئه وه یه که هێشوه ده نگیکی زمانه قه رزاره که ده چێته جیگای هێشوه ده نگیکی زمانه سه رچاوه که . ئه م گۆڕانه ده نگیانه به تایبه تی له قسه ی مرۆڤی ئاسایی وله خوینده واردا ده رده که وێ . هه رچه نده تێکدان و شێواندنی ده ربڕینی وشه له قسه کردندا به زمانێکی بیگانه دیارده یه کی په سه ند نی یه ، خوازه تێك شکاندن وشێواندنی دیارده یه کی بلاوه و به کاریکی ناپه سه ندا دانانری . یه کێك له ئه نجامه کانی ئه م فۆرمه شێواندنه ئه وه یه که که ره سه ی خوازراو زۆر که م له لایه ن قسه که رانی زمانه سه رچاوه که وه ده ناسرێته وه بۆ نموونه که م عه ره ب هه ست به وه ده که ن که وشه ی ته ی وده عبا و ئافره ت وشه ل . . . . . . . هتد له عه ره بیه وه خۆیان کردووه به زمانی کوردیدا ،

دیسانه وه قسه که ران زۆربه ی کات ئاگه داری ئه وه نین که ده نگی وشه خوازراوه که یان گۆڕیوه وته نانه ت زمانه وانیش له دوای شی کردنه وه یه کی ورده ته واوی پێره وی هه ر دوو زمانه که نه بێ پیش بینی ده نگ گۆڕانی بۆ ناکرێ وپێشی لێکولینه وه نازانی کام ده نگ ده گۆڕی وکه گوررا ده بێ به چی ده نگیك . بۆ نموونه ، یه کیك له تایبه تیه کانی که ره سه ی خوازراو له کوردیدا ، ئه و گۆڕانه یه که ئه یاسایانه ده دان :

( ۱ ) / ظ و ض /      / ز / ( ظاهر = زاهر

( ۲ ) / ط /      / ت / ( طاهر = تایه ر )

( ۳ ) / ص      / س / ( صدی = سه دا )

ته نیا لێکولینه ویه کی وردو زمانه وانیانه بۆمان ده رده خات که هه ر سێ یاسه که ده ربارە ی یه ك دیارده ن ئه ویش نه مانی به رمه لاشوو دان . له و وشه خوازراوانه ی له عه ره بیه وه هاتوون .

له به ر ئه وه ی زمان فێربوون روانگه ی فیرگار به رمبه ر زمانه بیگانه که ده گۆڕی کێشه فۆرم شێواندن وتێکدان ئالۆزتر ده بێ . به واتایه کی تر ، تافێرکار زیاترله زمانه بیگانه که بزانی ، که متر پێویستی به وه ده بێ ده نگه کانی ئه م زمانه ده ست کاری بکات وبیان گۆڕی . له به ر ئه مه له قوناغیکی خواستندا ، فیرکار

زۆر که ره سه کت ومت وه ك خۆیان ده هێنایه زمانه که ی خۆیه وه . ئه م راستی یه هه ندی زمانه وانی والی کردووه . باوه ر بکه‌ن که ده توانن به هۆی لێکدانه وه ی فۆرمی که ره سه ی خوازه وه وه نه خشه یه ك دابنین کاتی خواستنه که دیاری بکات به م جۆره ترگه ر ( Hauyen , 64 ) خوازه ی نۆی و خوازه ی نۆیتر دێرین له سه ر بناغه ی فۆنۆلۆجی له یه کتری جیاده کاته وه . خوازه ی دێرین به وانـه ده ڵی که فۆرمه که یا شێواوه ~~خوازه ی نۆیتر~~کت ومت ده چنه وه سه روشـه ی زمانـه سه ر چاوه که و خوازه ی نوی له نێوان ئه م دوو پله یه دا ده وه ستی . هه ر چه نده ئه م بۆ چوونه له شێوه یه کی گشتی کارێکی دروست ، ده بێ دوو که بۆ کوردی ئه م جۆره ی روانینه مان له بیر نه چێت :

( ١ ) هه ندی که ره سه ی خواز راو سه ربه م پۆلانه نابن ، به واتای ئه وه ی ئاسانی پۆلین ناکرین چونکه له و ده نگانه یان تێدا نی یه که ده گۆڕین ( ٢ ) جیاوازی نێوان خوازه ی دێرین ونوێتر ( خوازه ی تێکدراو وتێ‌نه شکاو ) زیاتر په یوه ندی به پله ی زمانزاني وه هه یه نه ك به کاتی خواستنه وه . زمانزانی له وانه یه پر بێته کایه وه ، له وانه شه چه ند نه وه یه ك بخایه نی ، له به ر ئه مه که ره سـه یه کی خـوازراو له وانه یه به چه ند شێوه یه کی جیاوازه لایه ن چه ند ئه ندامیکی کـومه لێکـه وه بخوازرێ ( بروانه : روعسل وروبع ( ربع ) یان ئینتیحان وئیمیتیحان ( إمتحان ) .

لێکدانه وه یه کی ئه وخوازانه ی له عه ره بیه وه هاتوونه ته کوردییـه وه گرێ دانیان له گه ل دیارده ی مانزانی دا وامـان پیشان ده دات کـه ئه مکـه ره سانـه له یه کێك له م سێ قوناغه دا خوازراون وفۆرمه‌کانیش به پی ی پێویستی قوناغه که گۆڕاوه : ـ

## ( ١ ) قوناغی دێرین ( سه ره تا )

---

ئه م قوناغه پێش بلاوبوونه وه ی زمانزانی هاتوته کایه وه ، به واتای ئه وه ی پێش ئه و قوناغه ی که خه ڵکه که کوردی و عه ره بی نوانی خوازه کان ژماره یه کی که م زمانزان وه ریان گرتووه ( به تایبه تی پیاوانی ئایینی له شێوه ی نووسینه وه ) وبه ناو زۆر به یه کی یه ك زمانیدا ( ئه وانه ی هه ر کوردیان زانیوه ) بلاویان کردوته وه . خوازه کان ته واو تێك دروان وزۆر که م ده ناسرینه وه یه کێك له تایبـه تیه کـانی

خوازه ی ئه م قۆناغه ئه وه یه که زیاتر له شێوه یه کیان له ده ربریندا هه یه و قسه که دلنیانی یه له وه ی کامه یان درووسته . نموونه : سنووق / سندووق راتوی راتب (فه قی ) ده قو / ته قو ( الباب ) . . . .

## ( ۲ ) قۆناغي نێوان

له م قۆناغه دا خه ڵکه کـه ( بـه تـایبه تی ) زیـاتر شـاره زایان لـه عه ره بیدا په یداکردوه . گۆرانی خوازه کان به پێی یاساو ده ستور ده روات به روه وبه ندی به په یره وی ده نگی زماني کوردییه وه . ( بۆ نموونه / ذ / ـــ / ز / له هه موو شوێنێکدا وله هه موو وشه یه کی خوازراودا ) . یه کێك له تایبه تیه گرنگه کاني ئه م قۆناغه دابه ش بوونه وه ی فۆنیمه کانی به تایبه تی ئه و ده نگانه ی هاوبه شن ( له هه ردووزمانه که دا هه ن ) . بۆ نموونه ده‌نگی / ت / له کوردیدا دووئه ڵۆفۆنی هه یه : / ت ۱ / له وشه ي تا ، تاريك ، تارا . . . / ت ۲ / که له / ط / عه ره بیه وه نزیکه له ده ورووبه ری ده نگی / ڵ و ڕ / : تاڵ ، ته ڕ ، تالآو ، ته ڕاو . . . له م قۆناغه دا له ژێرکاری وشه ی خوازراودا ئه م دابه ش بوونه ده گۆرێ و / ت ۲ / له هه ندێ د ه ورووبه ری تریشدا ده بینرێ وه ك له وشه ی ـ تاسه ( طاسه ) و تۆز ( طۆز ) داده رده که وێ .

## ( ۳ ) قۆناغی ئێسته :

له م قۆناغه دا دووزمان زانی زۆرتر بلاو ده بێته وه ومناڵی کورد هه ر له ساواییه وه فێری عه ره بی ده بێ وشاره زایی تێدا په یدا ده کات ، ئه و وشانه ی له م کاته دا ده خوازرێن که مترین گورانیان به سه رداديت وزۆربه ی بێ ده ستکاری وبه ده نگه ناموکانیانه وه دێنه کوردییه وه . یه کێك له تایبه تیه کانی قۆناغه که هاوردنی ده نگی نامۆییه له زمانه سـه رچاوه کـه وه ئه و وشـانه ی لـه قۆنـاغی یه کـه م ودووه مدا به شکاوی وشێواوی خۆیان کردووه به ناو کوردیدا ، لـه م قۆنـاغه دا ورده ورده راست ده کرێنه وه تاوای لێ دێت ده ربرینه (( هه ڵه )) که له قسه ی خوینده واردا بـه (( لـه کـه )) داده نـری وهـه ڵـه کـه ده بێتـه نیشـانـه یـه کی دواکـه وتـویی ونه خوینده واری ، بۆ نموونه ، وشه یه کی وه ك (( عیلاج )) و (( شریان )) و ((

شه هاده )) و (( شاعیر )) به گورانیکی زۆر که مه وه هاتوونه ته ناوکوردییه وه .
دیسـانه وه وشـه ی (( نه عله ت )) و (( جـوعمه )) و (( ئینتیحـان )) شێوه ی
راسته که ی خۆیان وه رگرتۆته وه و ـ ( له عنه ت وجومعه وئیمتیحان ) له قسه ی
خوێنده واردا به کارنایه ن بۆ ئه وه ی له که بۆ قسه که ر دروست بکه ن .

## رێزمانی خوازه : ـ

بۆ ئه وه ی خوازه بچێته زمانه نوی یه که وه و وه ك وشه ی خـۆماڵی هـه ڵسی
وکه وت بکات ، ده بێ وا خۆی بگورێ که له گه ڵ رێزمانی زمانه نوی یه که دا
بگـوونجی ، به واتـایه کی تـر ، ده بێ خوازه کـه بچێته نـاو یه کێـك له و پـۆله
رێزمانیانه ی که زمانه نوی یه که جیایان ده کاته وه . ئه گه ر ئه م پۆله رێزمانیانه
(ناو ، جێ ناو ، کار ، ئاوه ڵناو . . . . . . . ) له دوو زمانه که دا وه ك یه کتر نه بن ،
ئه وا ده بێ خوازه که له م ئاسته شدا بگورێ ، به واتای ئه وه ی ده بێ یه کێك له و
پۆله رێزمانیانه ی زمانه نوی یه که بۆ خۆی هه لبژێری ، بۆ نموونه ، ئه و ناوه ی
له عه ره بیه وه ده چێته زاره کانی سه رووی کوردییه وه ده بێ ره گه زی می یان نێر
هه ڵبژێری چونکه ناو له م زارانه دا دوو ره گه زیان هـه یه ولـه هه نـدی لایه نی
رێزمانییه وه کارێکی جیاوازییان له گه ل ده کری . به پێچه وانه شه وه ئه و نـاوه
عه ره بیانه ی که دێنه زاره کانی ناوه راسته وه کێشه ی هه ڵبژاردنیان له م رووه وه
له گه ڵ نی یه چونکه ئه م زارانه گرنگی به جیاوازی ره گه ز ( نێر و می ) ناده ن .
له م زارانه دا خوازه کان ده ناسرێن ( سنووقه که ) ، به نه ناسیاری ده مێننه وه
(سنووقیك ) ، کۆ ده کرێنه وه ( ئه م سنووقانه وسنووقه کان . . . . . . . هتد ) .
به واتایه کی تر هه مان ره وشتی ناو زمانی عه ره بی یان هه یه .
شایانی تی بینی یه که خواستنی ژماره یه کی زۆر له وشه له زمانێکه وه هه ندی
جار ده بێته هۆی شیکردنه وه ی هه ڵه و سه رهه ڵدانی دیارده ی سه یر وه ك :
( ١ ) خواستنی وشه به پاشگر وپێشگره وه ودانانی به وشه یه کی ساده ی له که رت
کردن نه هاتوو وه ك : (( مه علوومات )) ، (( ئه خلاق )) ، (( ئیشارات )) ، ((
موناجات )) . . . . . . . هتد .
( ٢ ) خواستنی پاشگرو فری دانی واتاکه ی وه ك پاشگری (( ـ ئات )) ی عه ره بی
که له هه ندی وشه ی کوردیدا بێ واتا به کاردێت .

وه ك : دیهات ، میوه هات / میوه جات . . . دیهانه کان ، ئه و دیهاتانه . . .
(کۆبوونه وه ی له گه ل نیشانه ی کوی کوردیدا نیشانه ی ئه وه یه که ـ ئات / هات
له وه که وتووره نیشانه ی کۆ بێت ) .
( ٣ ) خواستن وگوێزانه وه ی که ره سه ی زمانی له به شێکی ئاخاوتنه وه
بۆیه شێکی تریان به کارهێنانیان له دوو به شی ئاخاوتندا ( ناو وکار ) .
أ ـ له ناوه وه بۆ ئاوه لناو :

فلیمێکی زۆر عه جائب بوو : ( له (( عجائب )) ه وه ) .

ب ـ له ناو ( ی بکه ر ) ه وه بۆ ئامرازی سه ر سوورهێنه ر :

خالق ، چه ند دیمه نێکی جوانه .

ئه لاّ ، چه ند شارێکی پاکه .

جـ له ئاوه لناوه وه بۆ ئاوه لکار :

شکور نه هاتن بۆ لای من . ( له (( شاکر )) وه که ئاوه لناوه )

د ـ له ناوه وه بۆ ئاوه لناوێکی ( کوردی ) به هۆی پاشگره وه :

به خوا منالێکی نه حله تیه . ( لهنه ) ـ نه حله ت / نه حله تی

هـ ـ له ناوه وه بۆ ناوێکی ( کوردی ) به هۆی باشگره وه :

تف ونه حله تییان ده کات . ( ناو + کار )

دیسان ده ستت دایه وه بێ ـ حه یایی .

و ـ له ناوه وه بۆ ئاوه لناو :

هه ی بێحه یا : ( حیاء ) / ئه م ، پیاوه له هه موویان بۆشه ره فتره ( شرف ) .

ن ـ له کاره وه بۆ ناو :

ته شه کورت ده که م ( ناو + کار )

( له (( شکر )) ه ی عه ره بیه وه )

وه ك به م نموونانه دا بۆمان ده رده که وی ژماره ی ئه و که ره سانه ی ئه م
گورانه رێزمانیانه یان به سه ردی نه ك هه ر له کوردیدا به لکو زمانی تریشدا زۆر
که من وئه مه ش ده گه رێته وه بۆ ئه و مه یله ی که له زماندا هه یه بۆ پاراستنی
رێزمان که کاکلّه ی زمانه . ( Haugen , 74 )

له گه ل ئه و تیکه لاوی یه زۆره شدا که زمانی کوردی له گه ل عه ره بیدا
هه یبووه ، کوردی به زۆری هه ر ناوو ئاوه لناوی له عه ره بیه وه خواستووه و...

بەڕەگمەن کارو ئاوەڵکارو ئامرازی هەلگرتوتەوە . بۆ نموونە ، سەدان ناوی بوك حەج وزەکات وزەریبەو دائیرەومەکتەب ومودیروهوسەلیم وموزەف وفەراش وعیشق ومەحبەت ودەیان ئاوەڵناوی وەك رازی موسەعیدو مەرەخەس وحور لەعەرەبیەوە هاتوونەتە ناو کوردییەوە ، بەلاّم ژمارەی ئەو کارو ئاوەڵکارو ئامرازانەی کە کوردی خواستوونی بەپەنجەی دەست دەژمیرین ونەمانەش تەنانەت لە شێوازیکی تایبەتی کوردیدا دەبینرێن ( بۆ نموونە ئامرازی نەلا . . . هەر لە شیعری کلاسیکیدا بەکاردی ) .

بۆ ئاسانکردنی کاری تواندنەوەی خوازەو خۆماڵی کردنیان کوردی پەنا دەباتە بەر بۆتەیەکی ڕیزمانی خۆی ( کە شێوەی دارشتنی کاری لێکدراوە ) وبەشی هەرە زۆری ناوو ئاوەڵناوە خوازراوەکان دەکاتە ناو لەم قالبەدا . بەمەنەك هەر رەنگ وبۆیەکی کوردی دەدات بەم کەرەسە خوازراوانە بەڵکو بەهۆی بەشی دووەمی کارەکەوە کە وشەیەکی کوردییە لە نەسازانی گرەکی کوردی ووشەی خوازە رزگاری دەبێ . هەروەها بەهۆی ئەم بۆتەیەوە هەرچی ناوو چاوگی عەرەبیە نەك هەر وەك ناویان چاوگ کە ڵکیان لێوەردەگرێ بەڵکو بێ ئەوەی شێوەکەیان بگوری وەك کاریش بەکاریان دێنی وەك لەم نموونانەی خوارەوەدا دەبینین :

## کاری لێکدراو

———————— : -

### أ ـ بەکەرەسەی کوردی

١ ـ ناو + کار

نموونە : شەڕ دەکا ؛ سوێند دەخۆم ، ئاهەنگ دەگێرن . جنێو دەدەن . . . . .
هتد

٢ ـ ئاوەڵناو + کار

ئامادەخ کرد ، جوان بوو ، سووری کرد

٣ ـ ئاوەڵکار + کار :

نموونە : ڕۆچوو ، رای کرد ، هەڵ خست . . . . .

## ب ـ کاری لێکدراو ( به که ره سه ی عه ره بی )

١ ـ ناو + کار

زه کاتی دا ، زرییه ده دات ، حه فله ده که ن ، قه سه مت ده ده م ، ئیدیعا ده کات ، ئیعلانی ( ئیفلاسی کرد ) .

٢ ـ ئاوه لناو + کار

رازی ده که ن ، مه ره خه سم بکه ، قانیع ده بم .

مه منونت ده بم .

٣ ـ ئاوه لکار + کار

( ئه م جۆره کاره له کوردیدا به که ره سه ی خوازه ( له عه ره بیه وه دروست نابێ . ئه مه ش به ڵگه یه کی تره که ئاوه ڵکار زۆر بـه ده گمه ن لـه عه ره بیـه وه خوازراوه ) .

شایانی تێبینی یه که هه موو ناوو ئاوه ڵناویکی عه ره بی هه ر چه نـده نامـوو نه بیستراویش بێت زۆر به ئاسانی له کوردیدا له م بۆنـه ریزمـانیه ی سـه ره وه دا به کاردێت . به مه زمانی کوردی ده رگای به شێکی گه وره ی فه رهه نگی عه ره بی بۆ خۆی خستوته سه رپشت وبه ئاره زووی خۆی ده توانی وشه ی لێوه وه ربگرێ به ڵگه مان بۆ سه لماندنی ئه م باوه ره ئه و وشـه عه ره بیـه زۆرانه یـه که شـاعیره کۆنه کانی کورد به هۆی ـ کردن ودان . . . . . . . . ه وه ـ کردویانه به کوردی ووه ك وشه ی خۆماڵی ره فتاریان له گه ڵ ده که ن واله خواره وه هه ندی نموونه له سه ر ئـه م جۆره خـوازانه ده ده ین کـه به تـایبه تی لـه به رهـه می مه حـوی شاعیـردا به رچاومان که وتووه : ـ نه جاتی دا ، عه رضی حالم کرد ، حه لاّلی کرد ، ئیعتیکافی کرد ، ئیزنی دا ، منه ت ده کات ، لۆمه ی کرد ، له فکری چوو ، ته بلیغم کردن ، خزمه تی کردن ، قه تلك بکه ن ( واجیب ) ، شکاتی کرد ، وه صیه تی کرد ، سوال ده کا ، . . . . . . . . به م پی یه ، یه کـه م کێشه لـه خواستنی نـاوی عه ره بیـدا ئه وه یه که ده بێ پۆلێن بکرێنه وه له کوردیدا به پێی ئه وه ی لـه گه ل کـام له م کارانه دا ده رۆن چونکه وه ك ئه م نموونانه ده ری ده خه ن هه ندێکیان له گه ل (( دان )) ده بن ویه شی زۆریان ( کردن ) هه ڵ ده بژێرن ) نه جاتی دام ، حه فله مان کرد ئیزنی نه دان ، . . . . . . . . هتد ، هه ندی جار پۆلێن کردنه وه که لـه سه ر

بناغه ی واتا ده بێ ، به واتای ئه وه ی ناوه که کارێکی له گه لدا به کاردی که له گه ل هاووتایه کی یان ناوێکی نزیکی دا به کاربێ بۆ نموونه ، خوازه یه کی وه ك (( روخسه ت )) له ژێرکاری (( رێگا دان )) دایه که کاری (( دان )) هه ڵ ده بژێری . جاری واش هه یه هه ڵبژاردنی کاره که له خۆوه یه وبه پێچه وانه ی ئه م یاسایه وه ده بێ وه ك له خوازه ی (( ئیستراحه ت )) داده بینین . له ژێرکاری فریزیکی وه ك (( پشوودان )) دا ، ده بوایه (( ئیستراحه تیش )) هه ر (( دان )) ی له گه لدا بروایه ، که چی به پێچه وانه وه کاری (( کردن )) هه ڵ ده بژێری .

# به شی چواره م

## خزمایه تی له زماندا

### ١ ـ بنه مای خزمایه تی :

بۆ دیاری کردنی خزمایه تی دوو زمان یان زیاتر واتاکان پشت به چه ند شتێك ده به ستن : ـ
١ ـ لێکچوونی ووشه ( وه ك دانه یه كی واتا سازی )
٢ ـ لێکچوونی فۆنۆلۆجی ومۆرفۆلۆجی پارچه كانی راسته و ریزبوونیان . دوو زمان ئه م جۆره لێکچوونانه یان تێدا بێت ( به مه رجێك به هۆی خواستن وریکه وته وه نه بیت ) به (( خـزم )) داده نرێن ، لـه ری ی ئه م لێکچـوونانـه وه زمانـه وان ده توانێت (( خێزانه زمانه كان )) دیاری بكات ئێنجا بگاته (( بنه ماڵه كان )) زمانی خزم ئاسایی ده بیت (( دراوسی )) بن یان خزمایه تیه كه له ئه نجامی داگیرکردن كۆچ كردنه وه دێته دی . ( Längacker , 205 ) .

### ٢ ـ ئه و كۆسپانه ی كه دێنه ڕێگای دابڕین : ـ

ئه و كۆسپ وته گه رانه ی كه دێنه ری ی پولكردن ئه مانه ن :
١ ـ ئه و كه ره سه نووسراوانه ی كه له هه ندی زمان جیٚ ده مێنێت هێنده كه مه ماوه ی ئه وه مان ناداتی بڕیار ده ربـاره ی خزمـایه تی بـده ین ؛ ته نـانه ت ئـه م كه ره سه كه مه ش ، هه ندی جار ده ست كاری كـراوه ، بۆ نمـوونه زانیـاریمان ده رباره ی ، گریکی كۆن ، پروسی كۆن و( داڵماشی زۆر كه مه .
٢ ـ زانیاریمان ده رباره ی مێژوویی زمانه كانی گیتی وه ك یه ك نیه ، بۆ نموونه زانیاریان ده رباره ی سۆمه ری ده گه ریته وه بۆ چوار هه زار سـاڵ پیش میسری كـۆن سی هه زار ساڵ پ . ز ، زمانه سامیه كان تێكرا ٨٠٠ ساڵ پ . زمانی چینی ٢٠٠٠

سالْ . وهیندو ـ ئه ورو‌پی ۲۰۰۰ سال پ . ز ، هه رچی زمانه کانی تـره زۆر له پاش ئه مان دێن . بۆ نموونه : جۆرجی سه ده ی ٥ د . ز تیبینی ـ بورمی سه ده ی ۹ د . ز ، تورکی ، سه ده ی ۸ د . ز ، ئۆرالْی ، سه ده ی سیازده م د . ز هه ندێك زمانیش هه ن که له م دواییه دا شێوه ی نووسینیان په یداکردووه ( زمانـه هیندو ـ ئه مریکایه کان ، زمانه ئه فریقایه کان . . . . . . . هتد ) .

ته نانه ت له ناویه ك بنه مالْه شدا خێزانه زمانییه کان یه ك جۆر مێژو ناده نه ده ست . له ناو زمانه هیندو ـ ئه ورو‌پاییه کاندا ، زمانه هینـدو ـ ئیرانیـه کان ، که له هه موویان کۆنترن ، ده گه رینه وه بۆ ۱۵۰۰ ـ ۲۰۰۰ پ . ز گریگی کۆن سه ده ی هه شت د . ز ئه لبانی سه ده ی پازده د . ز به لتیکی سه ده ی شـازده . . . . . هتد ، ئاشکرایه که ئه گه ر زمانه هیندو ـ ئیرانیه کان وگریکی کۆن له گه ل ئه لبانی وبه لتیکی دا خزمایه تیان هه بێت ده بێت ئه م خزمایه تیه له که یدا دروست بوو بێت له کاتێکدا که جیاوازی ته مه نیان نزیکه ی سێ هه زار سال بێت . هه ندی جار (( خزمایه تی )) ون ده بێت یان ده بێت به ژێره وه له ژیره کانی خواستن یان به هۆی تر به ـ بۆ نموونه زمانی ئه رمه نی ئـه وه نده ووشـه ی زمانـه ئیرانیـه کانی خواستووه تاماوه یه کی زۆر زمانه وانه کان به زمانێکی ئێرانیان ده ژمارد .

## ۳ ـ دابرینه سه ره تاییه کان : ـ

یه کێك له دۆزینه وه هه ره گرنگه کانی زمانه وانی سـه ده ی نۆزده ئـه وه بوو که ئه و لێکچوونانـه ی که لـه رۆنان وده نگسـازی هه نـدی زمانـدا هه ستی پێ ده کرێت له ئه نجامی رێك که وتنیان خواستنه وه نیه ، به ڵکو ده گه ریته وه بـۆ په یوه ندی خزمایه تی له نێو ئه م زمانانه دا . به دوای بێره که ی سیر ولیم جونزدا نه گوایه لاتینی وگسریگی کـۆن وسه نسکـریتی له یـه ك سه رچـاوه هه لْقـولاْون زمانه کانی سه رده م که وتنه شی کردنه وه وبه راوردکردنی ئه و که ره سه زمانیانه ی که له به رده ستدا بوون تابتوانن شوێنی زمانه کان وپه یوه ندیان له گه ل یه کتردا دیاری بکه بۆ یه که م جار ئه م زانایانه زاراوی هیندو ـ ئه ورو‌پیان به کارهێنا بـۆ ناونانی ئه و کۆمه له زمانانه ی که سه ری زمانی هیندو ـ ئه ورو‌پی دێرینن . West )
42, )




نه‌ خشه‌ ی ( ١ )
( Barber , 1964 , 90 )

هیندۆ ئه ورووپی

ئه نادۆلی ( دێرین )

هیندۆ ئاری   به ڵتیکی   جێرمانی   کێلتی   ئیتالیك   گریکی

( ئه نادۆلی )   هیتیق

لیدی   لووسیانی   بالتیکی   لوبیانی

نه خشه ی ( ٢ )

( په یوه ندی هیتی له گه ل زمانه هیندو ئه ورووپیه کاندا )

( Wardhaugh , 1972 )

لـه سه ره تـاوه بنه مـالّه ی زمـانه هینـدو ـ ئه ورروبیـه كان ده كـران دوو به شی سه ره كی یه وه ( كێنته م وساته م )به‌پیێ ی گوتنی ئه و ده نگه كه له سه ره تای ئه و وشانه وه دێت كه به واتای سه د دێت له م زمانانه له زمانه كێنته مـه كانـدا ئه و ده نگه یه / ك / ده خوێنێته وه ، ئه وانیتر ، به پێچوانه وه به / س / یان / ش / ده خوینیته وه . به م پی ی یه ، لاتینی و ئیـرانی كۆن تـوخاری وگـریكی كۆن و جێرمانی به كێنته م دانران كومه لّه ی به لتبكی و سلاڤی و هیندو ـ ئیرانی به وه ك به نه خشه یه كی خواره وه‌دا‌ده‌رده كه ویت .

به شێوه یه كی گشتی زمانه كێنته مه كان رۆژ ئاوایین وزمانه ساته مه كان رۆژهه تین . جیاوازی نێوان ئه م دووكۆمه لّه به شێوه یه كی زانیاری ده سه لمێت به لاّم هه ندیێ راستی ده بنه كێشه و نه خشه كه تێك ده ده ن : ـ

١ ـ تۆخاری له ناوچه ی توركستانی چین داقسه ی پیێ كراوه ( واته رۆژ هه لاّتیه ) له رووی ده نگه وه زمانێكی كینته مه ( رۆژ ئاواییه ) .

٢ ـ هه ندی زمان له گه ل ئه وه شدا كه له دووبه شی جیاوازن ، پیوه ندی خزمایه تی نێوانیان زیاتره وه ك له دوو زمانی تركه سه ربه یه ك به ش بن ( بۆ نموونه ) .

فه ره نسی و سه نسكریتی له گه ل ئه وه شدا كه كێتنه من زۆر له یه كتره وه دوورن له پاش ئه وه ی كه دابرینی زمان به پی ی رۆژ ئاوایی و رۆژ هه لاّتی سه ری نه گرت له به ر ئه و كه م وكورتیانه ی كه لی ی دواییـن دا برینه كه ی ( ماكس میوله ر ) بۆ ماوه یه ك ناوبانگی په یداكرد به پی ی ئه م بیره ی میوله ر زمانه كانی گیتی ده بنه سی بنه مالّه ی جیاواز : بنه مالّه ی هیندو ـ ئه وریی ، بنه مالّه ی سامی و جامس و بنه مالّه ی زمانه تورانیه كان . هه ریه كه له م بنه مالاّنه ش له ده ها خێزان پێك دێت . كورتی بیره كه له وه دایه كه دوا بنه مالّه ( ـ تۆرانی ) بنه مالّه ی راستی نی یه ، به لّكو بریتیه له خێزانه زمانی جیاكه له به ریێ شوێنی كراونه ته ئیره وه وه كو خێزانه زمانی یابانی ، چینی ـ كینی یادافیدی . هیچ تایبه تیه كی ناوخۆ ئه م خێزانه زمانانه كۆ ناكاته وه وه هه رگیز ناچنه وه سه ر بنه مالّه یه ك ، له به ر ئه مه پاش ماوه یه ك ئه م دابرینه ش وازی لی هێنرا . ( Langaoker , 206 )

## ٤ ـ دابڕینه نوییه کان : ـ

دابرینه نۆییه کان زمانه کانی گێتی ده کـه ن به دوو بـه شه وه ، زمـانه هینـدۆ ئه ورووپه کان و زمانه ناهیندو ئه ورووپیه کان هه رچه نده هه موو زمانه وانه کـان رێك ناکه ون له سه ر ژماره ی ئه و خێزانه زمانه ی بنه ماڵه ی هیندۆ ئه وروپی پێك دێنن ( هه ندیك ٦ وهه ندیك به نۆ و هه ندیـك به یـانزه خێـزانی دا ده نێن ) ، هه موویان دان به م خێزانانه دا ده نێن ( Wardaugh[٢] 192 )

١ ـ خێزانی هیندو ئاری: ئه م خێزانه له دوو کۆمه ڵه ی سه ره کی پێك دێت :
زمانه هیندییه کان و ( سانسه کریتی پراکیتی ، زمانه هیندیه نوێیـه کان . . . . )
زمانه ئاریه کان ( فارسی وبلووجی وئه سیتی و په شتو و کوردی ) .

٢ ـ زمانی ئه رمه نی .

٣ ـ زمانی ئه ڵمانی .

٤ـگریکی کۆن : ئه م خێزانه زمانه یونانیه کۆنه کان و ( ئا یونی ، ئه ستیکی . . . . هتد ) ، ئه و زمانه ش ده گرێته وه که له سه ده ی حه وتی پ . ز دا په یدابوون

٥ ـ زمانه ئیتالیه کان : ئه مه ش ئۆسکی و ئه مبیری ولاتینی ده گریته وه جگه له فه ره نسی و ئیتالی و ئیسبانی ورۆمانی که راسته وخۆ له لاتینی په یدا بوون .

٦ ـ کێلتی : له سه ره تادا به ناو هه موو ئه ورووپای ئێسته دا باڵی کێشابوو ، به ڵام وورده وورده کشایه وه و ئێستاکه له هه ندی شوێندا له ناوچه ی ئیرله نـده ویلزو بریتۆن دا به کاردێت .

٧ ـ خێزانه جێرمانیه کان : ئه م خێزانه ده بێت به سێ به شه وه :

أ ـ جێرمانی رۆژ هه ڵات .

ب ـ جێرمانی سه ره وه ( زمانی ئایسانـدی و دانیمارکی وسـویدی ونـه رویجی ئه گرنه وه ) .

جـ ـ جێرمانی رۆژئاوا ( ئینگلیزی ساکسونی و هۆڵه ندی و فێلامندی ده گرنه وه ) .

٨ خیزانی به ڵتیکی ـ سلاڤی ـ

کـۆمـه ڵی بـه ڵتیکی لـه م خێـزانـانـه پێـك دێت : ڵیتـوانی و لاتـاڤی . . . . . . . . . . کۆمه ڵی دووه م ، سلاڤی کۆن و رووسی وپۆلۆنی و چیکی و سربی کرواتی و بۆلگاری نوی ده گریته وه .

زۆر له زمانه وانه کان باوه ڕیان وایه کـه زمانی هیتیتی کـه له ده ورو بـه ری ساله کانی ۱۵۰۰ د . ز له ناوچه ی ئه ند ول به کارهـات ، خێزانێکی هینـدۆ ـ ئه وریی پیه هه رچه نده نزیکیشی له م بنه ماڵه یه وه زۆر ئاشکرایه زیاتر له گه ل سلاڤی گریکی و زمانه هیندو ئه ورپیه کانی تردا ئامۆزایه نـه ك خوشـك ، وه کو نه خشه که ی خواره وه ده ری ده خات ( نه خشه ی دووه م ) .

## ٥ ـ مێژوو وگرنگی بنه ماڵه ی هیندۆ ئه وریی

وه ك زانیاری مێژ وی ده رنه خات هیندو ئه ورویپه کان که له سه ده ی سیٚ یه م یا چواره می پ . ز ژیان تا ئیستاش نیشتانه که یان ته واوی نه ناسراوه . هه ندێك مێـژ وو نووس لـه وباوه ڕه دان کـه ئه مـانه لـه بنچینه دا خـه ڵکی ئاسیـان وه له دواییدابه گیتیدا بلاو بوونه ته وه . ئه م بیره که م ری ی تێ ده چێت چونکه ئه گه ر وا بوایه ، ده بوایه زمانه بنه ره تیه که یان ووشه ی هه بوایه بۆ ئه و دیاردانه ی که له ئـاسیادا زۆره ، جگـه له مـه ش هیـچ پـاش مـاوه یـه کی مێـژ ووی ئـه م ڕایـه نه سه لمینێت . زیاتر ری تێ ده چێت که هیندو ئه ورویبه کان له ئه ورووپـا وه کۆچیان کردبێت . مێژ ووی نووسه کان سیٚ شوێن له ئه وروپادا سه رووی ئه ڵمانیا ، دۆڵی دانووب ( ده شته کانی هه نگاریا ) ، سه رووی ده ریای ڕه ش ( ده شته کانی ئوکرانیا ) . شوێنی سێیـه م ، به لای زۆربـه ی مێژ وو نـووسه وه لـه هه مـویان په سه ندتره چونکه دانیشتـوانه کـانی ( ۲۵۰۰ ساڵ پ . ز ) ی ئـه م ناوچـه یه له ره وشت خوو و چه که کانی ده ستیاندا زۆر ده چنه وه سه ر خه ڵکی میستـا و ئه نادوڵ وسه رووی میسوپۆتامیا ، ئه مانه ش ئاشکرایه که ئه ورووپی بوون ده بێ ئه و راستیه ش بزانین که هیندو ئه ورووپیه کان زۆر جار له کۆچ کـردندا تـوشی خه ڵکی له خۆیان پێش که وتوو تربون ( وه ك دانیشتوه کانی هیندو میسوپۆتامیا هۆی کوچ کردن و بـلاوو بوونـه وه ی ئه م هینـدو ئه وریـا نه زانـراوه ، به لاّم وه ك ده رده که وێت بلاماری دراوسی یه که نیان وگۆرانی ئـاوو هه واو ده وری بـووه . گرنگی ئه م بنه ماڵه یه له وه دایه زیاتر له هه زاران ملیون قسه پێکه ری هه یه له ئه ورووپا و ئاسیادا .

### ٦ ـ زمانە ناهیندۆ ئەورووپیەکان

ئەم کۆمەڵە لە چەند بنەماڵە یەکی جیا جیاپێك هاتووە ، گرنگترینیان بنەماڵەی سامی وحسامیە کە بەم شێوە یە بەسەر چەند خێزانیکدا دابەش دەبن ( Barber , 74 ) :



یه کێك له تایبه تیه هه ره گرنگه کانی ئه م بنه ماڵه ین ئه وه یه که زۆربه ی وشه کانیان له سێ ده نگی نه بزۆینه وه داده تاشین به هۆی زیادکردنی بزوێن ( که له نووسیندا ده رناکه وی له سه ره تاوه له ناوه راستدا و له دوواوه :
له ( ك ، ت ، ب ) وه ، بۆ نموونه ئه م وشانه له عه ره بیدا داده رێژرێت : کتب ، یکتب ، کاتب ، کاتبة ، مکتبه ، کتب ، مکاتب ، مکتبات ، . . . . هتد .
بنه ماڵه یه کی له کۆمه له ناهیندو ئه ورپیه کان بنه ماڵه ی ئورالی و ئه لتاییه که وه کو ئه م نه خشه یه ی خواره وه دابه ش ده بن : ( Barber , 75 )




جگه له م دووبنه ماڵه گرنگه زمانه ناهییندو ئه وره پیه کان ئه م بنه مالانه ش ده گریته وه
١ ـ درافیدی ( خواروی هیند ) ، تامبل ، تیله کو . . . .
٢ چینی ـ تیبتی : تسایله ندی وبورمی وتیبتی ودایلیکته کانی زمانی چینی .
٣ ـ ملایو پۆلبنیزی .
٤ ـ پانتو ( ئه فریقیا ) : سواهیلی زولو .
٥ ـ سودانی وکینتی : هوسا .
٦ ـ هیندی و ئه وریکی : هۆچی وئه پاشی .
٧ ـ قه فقاسی : جۆرجی .
٨ ـ باسك : ( ناوجه ی بیره نیز ـ سنووری فره نسا و ئه سپانیا ) .

## ٧ ـ دیاوده ی داپچراندن ویه کگرتن له گه شه ی زماندا :

له گۆرانی زماندا دوو رووکاری سه ره کی دێته به رچاوو : رووکاری داپچراندن ویه ك گرتن . زۆر جار له مێژوودا ده رده که ویت که زمانیك داده پچریت به واتای ئه وه ی که وت ده بیت وچه ند زمانیکی تری لیوه په یدا ده بێت دروست بوون و هاتنه کایه ی زارو زارۆچکه کانی زمانه کانی گیتی هه ر له ئه نجامی گه شه یه کی مێژوویی وه اوه ده بێ . نموونه ی مێژووی له م جۆره روکاره زۆره چاوپیا خاشاندنیك به نه خشه کانی ئه م به شه دا ئه م راستیه مان بۆ ده رده خات داپچرینی لاتینی ده بێت به هۆی په یدا بوونی فره نسی وئیتالی وئه سپانی ورۆمانی ئیسته هه روه ها داپچرانی بنه ماڵه ی هیندو ئه ورووپی بونه ته هۆی په یدا بوونی ئه و هه موو خێزانه زمانانه .

هه ندێ جار ، زمانیك له جیاتی ئه وه ی داپچریت ، باڵ به سه ر زمانه نزکه کانی تری بنه ماڵه که دا ده کێشێت هه موویان ده کات به یه ك به م رووکاره ده وتریت یه ك گرتن له گۆراندا بۆ نموونه ، له ناو بنه ماڵه سامی و حامیه کاندا عه ره بی باڵی به سه ر هه موو بنه ماڵدا کێشاوه زۆربه ی زمانه کانی تر له ناوچوون ئه م له لاتینی ئه میری ئۆتوسکانی پیك ده هات به لام که رۆمانیه کان ئیتالیان گرت ، زمانه که شیان به سه ر هه موو ئه وانیتردا زال بوو . پاش ماوه یه ك هه ر خۆی له کۆرادا مایه وه ئه وانی تر له ناو چوون .

## ٨ ـ نواندنی په یوه ندی خزمایه تی

دووڕێگه مان هه یه بۆ نواندنی پیشاندانی په یوه ندی خزمایه تی نێوان دوو زمان یان دوو کۆمه له زمان . : ـ نواندن به هۆی دارو لق وپوپه وه نواندن به هۆی شه پوله وه رێگه ی یه که م له داهێنانی ئوگست شلایخه ره وه ده گه رینه مبۆ ساڵی ٨٦٦ . له گه ل ئه وه شدا که م وکورتی زۆره ، ئه م رێگایه به رده وام به کاردێت چونکه ئاسانتره له ریگه ی دووه مدا به پی ئه م رێگایه هه موو زمانه لقه کانی لقوپۆیه که یه وه په یدا ده بێت . به م جوره خێزانرکیلتی و ئیتالیك هیندو

ئه وروپه وه په یدا بوه لاتینی و ئه میری ئوسکانی له ئیتالیه وه و واڵماشی و ئیرله ندی کۆن له کێلتیه وه .

ئه م رێگایه ی نواندنه هه ندی کێشه مان بۆ دێته کایه وه ، بۆ نموونه : به پێ ی ئه م بۆ چوونه لاتینی که خۆی زمانێکی مرده یه ده بێ باوکی فره نسی نوی ی . ئه مه له کاتێکدا راستروایه بلێین لاتینی ئه و فه ره نسییه یه که له فه ره نسا قسه ی پێ ده کرێت یان لاتینی بوّته فه ره نسا له فه ره نساو ئه سپانی له ئه سپانیا و ئیتالی لـه ئیتالیا . . . . . .

جگه له مه ش ، نواندن به هۆی دره خت ولقه کانیه وه وامان تێ ده گه یه نێت که ده توانین به ئاسانی زمانه کان له یه کتر جیـا بکه ینـه وه وه هیچان نـاکه ونـه ژێرکاری یه کتره وه ودانیش به بوونی دیـالیکتدا نـانیت هه نـدی زمانـه وان ، بۆ ئه وه ی له که م و کورتی نواندی ـ ریگـای یه کـه م رزگاریـان ببێت رێگایـه کی ترده گرن بۆ نیشاندانی په یوه ندی و خزمایه تی رێگای شه پۆل بـه پی ی ئه م بـۆ چوونه هه ر زمانێك وه رگرین وله هه ر کاتێکی مێژوویيدا لێ ی بکۆلێنه وه ده بینین پێك هاتووه له چه ند دایلیکتیك . ئه م دایلیکتانه ش له هه ندی شوێندا ده چن به ناو یه کتردا . ته نانه ت ئه و کاتانـه ش که دایلێکتـه کان ده گـۆرین بۆ زمـانی سه ربه خۆ ده بینین په یوه ندیان له گه ل یـه کترا ده مێنێت وهێشتـا له ژێـرکاری یه کتردا ده بن به تایبه تی له ناوچه کانی سنووردا چونکه گۆران له شێوه ی شه پولدا له چه قه وه ده رده چێت .

ئه م رێگایه که له داهینانی ( یۆهانس شمیت ) ی ئه لمانیه وه له سالی ۱۸۷۲ وه خراوه ته به ر چاو زیاتر له رێگای یه که م نارێك وپێکی گۆران لێك ده داته وه و راستتر بۆ کێشه که ده چی ، به لام زۆر که متر به کـار دێ چونکـه زۆر هۆی تێ ده که وی که به ئاسانی بۆمان راناگیرێت ( Wardhaugh , 194 )

# به شی پینچه م

## (( واتا ســـازی ))

### ١ ـ سه ره تایه ك :

زاراوه ی سیمانتکس ( واتاسازی ) له وشه ی گریکی ( Sema ) وه هـاتووه کـه به واتـای نیشانـه یان ره مز دیّت . وه ك زاراویّك کـه به شیّکی زمـانه وانی بگریّته وه وشه که بۆ یه که م جار له لایه ن میشیل بریله وه له سالّی ١٨٨٣ دا به کار هات ، هه ر چه نده زۆر پیّش ئه مه ش هه ست به پیّویستی زاراویّکی وا ده کرا . پاش ماوه یه ك به کار هیّنان ، زاراوه که ته مومژ یکی زۆری لیّ نیشت له به ر چه ند هۆیه ك :

١ ـ زاراوه که به ته نیا له زمانه وانیدا به کار نه هات به لْکو له زۆربابه تی زانستی تریشدا وه ك واتاسازی فه لسه فه یی که لایه نیّکی ( عه مه لی ) هه یه که زۆرجار له ژیّر ناوی واتا سازی گشتی دادیّت . به سه ندکه رانی ئه م جۆره مانا سازیه ، زانایانی وه ك ( کورزیسکی ) و ( چه یس ) و ( هایاکاوا ) به دوی ئه وه دا ده گه ریّن که به کارهیّنانی وشه ی روت وخراپ به کارهیّنانی تری زمان ( به مه به ستی درۆ وخه لّه تاندن وله خشته بردن ) نه هیّلّن له ره چه لّه که وه . ( Leech , 499 )

٢ ـ ته نانه ت له ناوچوار چیّوه ی زمانه وانیشدا زاراوه کـه به زۆر واتـای جیاواز به کار دیّت ئه مه ش ده گه ریّته وه بۆ دوو هۆی سه ره کی :

أ ـ واتا ته نیا به ندنیه به وشه وه به لْکو له دانه کانی خوارو وشه و سه روو وشه شدا ده بینریّت . له سه روو وشه وه فریزو رسته و بگره دانه کانی سه روو رسته ش واتا به خشن . له خواروشه وه مۆرفیم ( به ندیان به ره لّلا یان گره ك ) واتـا داوه . له گه لّ ئه مه شدا زۆربه ی کات مه به ست له واتا سازی ته نیا واتای وشه یه .

ب ـ زاناکانی زمان هه موویان ریّك ناکه ون له سه ر مه به ستی واتا سازی .

به لای هه نـدیّکیانـه وه ( وه ك فیّرث وهـاوه لّه کـانی ) واتا سـازی هه مـوو زمانه وانی ده گریّته وه چونکه به لایانه وه له واتا لیّك دانه وه به ولاوه زمانه وانی هیچ ئه رکیّکی تری نیه . لای هه ندیّکی تریـان ( ئاوڵمـان ، بۆ نمـوونه ) واتـا سازی وره وانبیّژی له یه کتر جیانابنه وه . زمانه وانیش هه یه که بـاوه ری وایه کـه واتا

سازی ده بێت بۆ لێکدانه وه ی واتای سه ره کی یان هەوشه کی خۆی تـه رخان بکات وپه یوه ندی واتایی شی بکاته وه .

له نیوسه ده ی یه که می له دایك بوونیدا ، واتا سازی زیاتر بابه تیکی مێژ ووی بوو . زمانه وانه کان زیاتر خۆیان به گۆرانی واتاو دابڕین وهۆکـانی گۆڕان وئـه و باسانه ی که ڕووکاری گۆڕان دیاری ده که ن ماندوو کردبوو . به دوای سییه کاندا ، شۆڕشێکی مه زن له م بابه ته دا به رپا بوو . گوی دان له واتا گۆڕانه وه گۆڕرا بۆ واتا سازی وه سفی ( ئه و ده وره گرنگه ی که وشه ی له کـاتێکی دیاری کـراودا له زمانێکدا ده بینێت ) . له گه ڵ ئه وه شدا که ئێستاش لێکوڵینه وه ی واتا له ڕووی مێژ ووه به رده وامه ، واتا سازی ئه مرۆ ڕووکارێکی وه سفی ئیسته یی تێدا ده بینرێت

## ۲ ـ گرنگی واتا ســـازی

گرنگی واتا سازی له وه دایه که په یوه ندییه کی ڕاسته وخۆی له گه ڵ له یه کتر گه یشتندا هه یه . تا ده وری له یه کتر گه یشتنشی له ڕێکخستنی کۆمه ڵدا زیاتر بێت ، پێویستمان زیاتر به واتا سازی ده بێت . جگه له مه ش لێکـۆڵینه وه ی واتـا هۆیه که بۆ تی گه یشتن له مێشکی مـرۆڤ . بیرو بـۆ چۆنیـه تی وهۆش لـه گه ڵ تی ڕوانینن ودابڕینی خییره مان به هۆی زمانه وه وا تێك ئاڵاون که نازانین کامیان زاڵه به سه ر ئه وی تردا و کامیان له چوار چێوه ی ئه وی تـریانـدا دروست ده بێت ، هه رچه نده زۆر زمانه وان تا ئێستـاش باوه ڕیـان به گـریمانـه ی ( وۆرف ) هه یـه که‌هه‌مه‌ڵێت زمان بڕیار ده دات چۆن هه ست به ده ورو به ری خۆمان ده که ین .



## ۳ ـ جۆره کانی واتا

واتـا به شێـوه بلاوه کـه ی که هـه موو ئـه و شتـانـه ده گـرێتـه وه کـه زمـان ده یگه یه نێت ده بێت به چه ند جۆرێکی جیاوازه وه . له مانه له هه موویان گرنگتر واتای لۆجیکی یان ( هۆشه کی ) وکێشه کی وبابه تیه ( Leech , 10 - 27 )

## واتای هۆشه کی

ئه م جۆره واتایه سه ره کی تره له هه موو ئه وانیتر له به ر دوو هۆ :
١ ـ واتای هۆشه کی ، به پێچه وانه ی هه موو جۆره واتاکانی تره وه ، خاوه نی رۆنانێکی وا رێك که به ئاسانی به راوورد ده کرێت له گه ڵ رۆنانی ئاسته کانی تری زماندا . به تایبه تی ، رۆنانی فۆنولوجی ورسته سازی . ئه م رۆنانه ش له سه ر ئه م بنه مایه کار ده کات .
أ / بنه مای سێمای جیاکردنه وه : ـ ئه م جۆره تایبه تیه بنه مای دابرینی فۆنۆلۆجیشه له وه دا که ده یده ین به ده نگێك ، ده بێته پێناسه ی ئه و ده نگه به شێوه ی سه لبی یان ئیجابی . بۆ نموونه ره مزی فۆنه تیکی / ب / کۆمه ڵه سێمایه کی جیاکردنه وه ده ینوێنێت . له مانه دوو لێو ـ ئاوازدار ـ ده رباز ـ ده می ـ ناو لووت . . . . . هتد به هه مان شێوه ، واتـای هۆشـه کی زمانیش هـه ر له رۆنـانێکی وه ك ئه مـه دا ده رده برێت . به م پێ یه واتای وشه ی ( ژن ) ده توانرێت به م جۆره به هۆی ئه م تایبه تیـانه وه دیـاری بکرێت ( + مـرۆڤ + هه راش ـ نێر ) یان جیـابکرێتـه وه له وشه یه کی وه ك (( کور )) که بۆ نموونه ، ئه م تایبه تیانه ی تێدایه ( + مرۆڤ ـ هه راش + نێر ) .
ب / بنه مای که رت بوون بۆ پارچه پێك هێنه ره کان : ـ
ئه م بنه مایه له که رتی بچـووك بچوکـه وه ده مان گـه یه نێتـه دانه رێـزمانیـه گه وره کان یان به پێچه وانه وه ئه و توانایه مان ده داتێ که واتای رێزمـانی گه وره له ت بکه ین بۆ که رتی بچوکتر .

## ٢ ـ واتای کێشه کیه تی

ئه مه ش چه ند جۆریکی جیاوازی هه یه :

### أ / واتای لاوه کی

ـــــــــــــ : ئه و واتایه یه کـه فۆرمێـك ده یگه یـه نێت جگه لـه واتا هۆشه کێکه ی . ئه گه ر وشه ی ( ژن ) هۆشه کیانه پێناسه بکه ین به وسێ تایبه تیه جیاوازکه ره ی که باسمان کرد ( + مرۆڤ − نێر + هه راش ) ده بینین ئه م تایبه تیانه

٢ ـ واتای لاوه کی : تیایدا گۆرانی زۆر تێدایه ، به واتایه کی تر راده ی گۆرانی به پێ ی جۆری کۆمه ڵ وشه ده ی مێژ ووی وخیره ی که سی .
٣ ـ واتای لاوه کی ( ده روونی ) خاوه نی سنورێکی دیاری کراوی داخراو نیه به ڵکو به پێچه وانه ی واتـای هۆشـه کیه وه لاکـانی کراوه تـه وه هه ر وه ك چۆن زانیاری وبیروباوه ڕ به رامبه ر دنیالاکانی کراوه ته وه و هه میشه له زۆر بووندایه .

## ب ـ واتای ویژدانی وشێوازی

واتای شێوازی ئه و واتایه یه کـه زمانی ده یگـه یه نێت ده ربـاره ی ئه و بـاره کۆمه ڵایه تی یه ی که تێیدا به کار دێت . هه ندێك له وشه کان و شێوه ی گوتنه که جۆری دایلێکته که مان بۆ روون ده کاته وه ، هه ندێکی تریان چینی کۆمه ڵایه تی قسه که ره که مان بۆ ده رده خات ، تایبه تی راش هه یه که په یوه ندی قسه که رو گوێگرمان بۆ ده خاته روو .
کریسته ل چه ند شێوازێکی جۆربه جۆری لـه زمانی ئینگلیـزیدا جیـا کـردۆته وه له مانه :
١ ـ ئه و تایبه تیه شێوازیانه ی که هه میشه ین :
أ ـ که سایه تی ( زمانی فلان وفیسار . . . . . )
ب ـ دایلێکت .
جـ ـ کات ( زمانی سه ده ی نۆزده . . . . . . . )
٢ ـ گفتوگۆ :
أ ـ شێوه ( نووسین قسه کردن )
ب ـ به شداری کردن ( دوو که سی ، له به رخوه )
٣ ـ ئه و تایبه تیه شێوازیانه ی که کاتین :
بابه ت ( زمانی یاسا ، زانست . . . . . )
پایه ( به رێزه وه ، بازاری . . . . . )
که م جاررێ ده که وێت که واتای هۆشه کی وشێوازی دوو وشـه یه واو وه ك یه کتر بن به واتایه کی تر ، زوربه ی وشه ی هاو واتا ته نیا له واتای هۆشه کی دا هاوبه شن ئه مه ش وای له هه ندی که س کردووه که بۆومانیمان له وه هه بێت

که زمان وشه ی هاو واتای ته واوی تێدابێت . ئه گه ر مه به ست له هـاو واتایی به رامبه ری ته واوی وشه بێت له هه موو جۆره واتاکانیدا ئه وا زۆر به ده گمه ن دوو وشه ی هاوتا هه ڵ ده که وێت . به ڵام ئه گه ر مه به ست له هاووتای به رامبه ری بێت ته نیا له واتای هۆشه کیدا ، ئه وا ده توانین زۆر وشه بدۆزینه وه که له واتای هۆشه کیدا وه ك یه ك بن وله واتای شێوازیدا جیاوازین .

ئه سپ / هه سپ ئاسمان / عاسمان

یۆنان / وێنان ته رزه / ته زره

فری / رفی . . . . .

زمان زۆر جار ده توانێت هه ستی قسه که ریش بنوێنێت به رامبه ر ئه وبابه ته ی کـه قسه ی لی ده کـات . به م جـۆره واتایـه که بـه هۆی واتـای هۆشـه کی یان لاوه کیه وه ده رده برێت ، ده وترێت واتای ویژدانی . ئه و کـه سه ی کـه پی ی ده وتـرێت (( بلمێ ی مـرۆڤێکی خۆ پـه رست وبێ که ڵکی )) هـه رگیز گـوومانی له هه ستی قسه که ره که نیه به رامبه ری . زۆرجار قسه کـاتمان بـه پی ی پله ی رێزلێ گرتن که جۆرێکه له هه ستی قسه که ر ده گۆرێن :

( ۱ ) ده مت لێك نێ . ( رێزلی گرتنی تێدا نی یه ) .

( ۲ ) ئه وه نده مه ڵێ . ( باشارد له ( ۱ ) ، رێزگرتنی که متره له ( ۳ ) .

( ۳ ) بی ده نگ به . ( رێزی له گه ڵدایه ) .

هه ر چه نده واتای ویژدانی له سه ر واتاکـانی تر ده ژی ( بـه واتای ئـه وه ی له گه ڵ ئه مانه دا پێکه وه دێن ) ، زۆر جار بێ ئه مانه به هۆی ئاواز یان هه ندی وشه ی هه ست پیشان دانه وه ده رده برێت .

جـ / واتای بیره کی وتێکه ڵی

---

: واتـای بیـره کی کـاتێـك دێتـه کـایـه وه که فۆرمێك زیاتر له واتایه کی هۆشه کی هه بێت وکه گوێمان لـه یه کێکیـان بێت ئه وی ترمان بێته وه بیریان به هۆی ئه وه وه که ئه مه یان بێوتره وزۆرتر به کاردێت یان به هۆی ئه وه ی که زۆر له گه ڵ یه کتردا دێن . ئه م جۆره واتایه به تایبه تی له هه ڵبـه ستدا کـاری خۆی ده کـات . واتای بیـره کی به زۆری کـاتی هه ستی پی ده کرێت که یه کێك له واتاکانی فورمه که قه ده غه بێت به هۆی به ند بـوونی به فه سله جه ی جینسه وه . هه ر ئه مه شه وای کردوه که هه ندی فۆرم ( وه ك

خستنه سه رو ێ خزان وهاتنه وه . . . . . هتد ) زۆرکه م به کاربین، هه ر چه نده یه کێکیش له واتاکانیان زۆر بی گوناحه . بلووم فیلدهه ر له زووه وه باوه ری وابوو که له حالّه تی وادا به هۆی ئاشنایی به کێك له واتاکانی فۆرمه که له گه لّ باوه ری قه ده غه کراودا واتا ئاساییه قه ده غه نه کراوه که ش له ناو ده چێت وده مرێت .
واتای تێکه لّی ئه و واتایه یه که وشه به هۆی هه لّس وکه وت وهاتنی له قه واره ی وشه ی تردا په یدای ده کات . بۆ نموونه وشه ی (( زیره )) و (( حه په )) و (( نه ره )) له هاواتا ده چن وله رووی واتاوه ناوکۆییان شه یه ( هه موویان جۆری ده نگ پیشان ده ده ن ) . له گه لّ ئه وه شدا هه ریه که یان له ویتریان جیایه بـه هۆی ئه وه وه که هه ریه که یان له گه لّ ناوێکی جیاوازدا هه لّس وکه وت ده کات ودێت هه ر وه ك له م رستانه دا ده رده که وێت :

منالّه که زیراندی
شێره که نه راندی
سه گه که ت ده حه پینێ .

بێ گومان ده بێت ئه وه بزانین که هه موو ئه و هه لاّنـه ی که لـه ئه نجـامی هه لّس وکه وتی نارێکی وشه دا دێته کایه وه به هۆی تێکدانی واتای تێکه لّیه وه نی یه . هه ندێکیان له وانه یه بگه ریێنه وه بۆ تێکه لّکردنی چه ند شێوازیك وهه ندێکی تریان بۆ تێکه لکردنی واتایی . بۆ نموونه ، چاو پیاخشاندنیك به م دوو رسته یه ی خواره وه دا بۆمان ده رده خات کـه رسته ی ( ۱ ) بـه هۆی تێکـه لّکردنی چـه ند شێوازیه کۀ وه ناپه سه نده ورسته ی ( ۲ ) به هۆی تێك چوون ولادان لـه واتای هۆشه کیه وه نارێکه :

۱ ـ سواره دلێره که خۆی فری دایه سه ر هه جه که .
۲ ـ چۆله که که لاکی که ره که ی هه موو خوارد .

واتای هاوکێشه کی به شێوه یه کی گشتی هێنده پێچ وپه ناو قوژبنی زۆره که زۆر به گران ده ست ده دات بۆ لێکولینه وه . له به ر ئه مه واتا سازی خۆی به واتای هۆشه کی یه وه زیاتر خه ریك ده کات چونکه ئـه گه ر واتـا به م جـۆره که برت نه که ین وجیایان نـه که ینـه وه له به ده کتری وبمـانه وێت لـه هه مـوو حۆره کـانی بکولینه وه ئه وا وه کو بلووم فیلد خومان به رامبه ر گرانی ئه رکـه که بـۆ ناگیـری

وناچار ده بین بگه ریینه وه دواوه وه. موو واتا دانین بو سه رده میك کـه زانیاری زیاتر تیدا پیش که ویت تا چاری واتامان بو بکات .

## ٣ ـ واتای بابه تـــی

ئـه و واتایـه یه کـه قسه کـه ریـان نـووسـه ر بـه هـوی شیـوه ي ریکخستنی مه به سته که وه ده یگه یه نیت : چی که ره ... یه ك پیش ده خات ، چی ده باته دواوه وله سه رچی ... ور ده بیت وچی به لایه وه گرنـگ نیه . . . . هتـد واتای بابه تی نه ... هه ره یه یوه ندی به رونانی ریزمانی یه وه هه یه به لکو بریتی یه له کیشه ی هه لبژاردنی ئـه و رونانـه ریزمـانیـه کـه بـه بـاشتـری ده زانـین بـو ... ه یـانـدنی مه به سته که مان له ناو هه موو ئه و رونانه دا که زمانه که ریگایان ده دات .

١ ـ
أ ـ که ره که که پره که ی خست .
ب ـ که پره که که ره که خستی .
ج ـ که پره که نه وت .

٢ ـ
أ ـ سه روکی به شی خه لاتی یه که می پیشکه ش کرد .
ب ـ خه لاتی یه که م سه روکی به ش پیش که شی کرد .
ج ـ خه لاتی یه که م له لایه ن سه روکی به شه وه پیش که ش کرا .
د ـ پیش کـه ش کردنی خـه لاتی یه کـه م له لایـه ن سـه روکی به شه وه بوو .

٣ ـ
أ ـ سنمان له ده رگاکه ده دات .
ب ـ ژیله یه له ده رگاکه ده دات .

٤ ـ
أ ـ باوکی چاکترین دوکانی سه وزه فروشی هه یه له گوزه ره که دا
ب ـ چاکترین دووکانی سه وزه فروشی له گوزه ره که دا هی باوکیتی .

هه موو ئه و کۆمه ڵه رستانه ی سه ره زه که م و زۆر واتای هۆشه کیان یه که .
له گه ل ئه مه شدا ده بینین که له ده رهێنادا جیاوازن . هه ریه که یان بۆ کانیك یان
باریك ده بێت . بۆ نموونه که ده پرسین :

سه روکی به ش چی پێش که ش کرد ؟

وه لامه که ده بیت هه ر ( ٢ ـ أ ) بێت . به لام که ده پرسین :

له لایه ن کێوه خه لاتی یه که م پێش که ش کرا ؟

وه لامه که ده بێ ( ٢ ـ ج ) بێت هه روه ها له کۆمه ڵی سێه مدا که ده پرسین : کێ له
ده رگا ده دات ؟ وه لامه که ده بێت ( ٣ ـ أ بێت . به لام که بپرسین کێ یه به م
ته قه ته قه ژیانی لی تاڵ کردین ، ئه وا وه لام ده بی ( ٣ ـ ب ) بی لێره دا شێوه ی
رێکخستنی مه به سته که یان واتای بابه تی خۆی ده سه پێنی و ناچارمان ده کات
که ته نیا یه کێك له م رۆنانه لێکچووانه به دروست دابنێین .

## واتا سازی وشه : ـ

### ٣ ـ بۆ چوونی مه نتیقی :

ئه م بۆ چوونه گوێ ده داته ئه و په یوه ندییه مه نتیقیانه ی که له نێوان وشه کانی
زماندا هه یه ( په یوه ندی واتایی ) ئه م په یوندییانه ش ده بن به چه ند جۆرێکه وه
( Lyons , 1969 , 449 — 470 ) :

**١ ـ گرتنه وه**

ره نگدانه وه ی تایبه تیه کی مێشکه : توانای پولکردن یان دابرین . ده نگه
وشه یه کی گشتیه که باڵ به سه ر ـ سپی و ره ش وسه وزو سوور و زه ردو ... شیندا
ده کێشی هه روه ها وشه ی سوز خۆشه ویستی و رق وترس و کینه ده گرێته وه .
گرتنه وه ، که واته ، دۆزینه وه ی ئه ندامانی پۆڵکه ی : گوڵ ( پول ) ، گوڵه باخ ,
مێخه ك , نه سرین , ردالیا , ( ئه ندامانی پول ) ده گرێته وه .
په یوه ندی گرتنه وه له زمانێکه وه بۆ زمانێکی تر ده گۆریت په تایه له کوردیدا نه له
پۆلی سه وزه ونه میوه داده نرێت له ئنگلیزیدا ، به پێچه وانه وه ، ده چێته کۆمه ڵی
سه وزه له کوردیدا وشه یه کی گشتی نی یه که مریشك و که له شیر و قه له موون .
بگرێته وه ، له ئنگلیزیدا وشه ی ( Poultry ) وله عه ره بیدا ( الدواجن ) ئه م
ده وره ده بینن .

**٢ ـ هاوتایی :**

به شێوه یه کی گشتی هاوواتایی به دوو شێوه پێناسه ده کرێت :

أ ـ دوو وشه یان زیاتر که یه‌ك واتا ببه خشن ، به م جۆره : ده ربه ده ربه لاته مولز و ئاوار هاوواتان .

ب ـ دوو وشه یان زیاتر که نه ك هه ر واتایـان وه ك یه ك بێت به لکو له بریتی یه کتریش بێن له وتندا . به م پێیه به جوان و قه شه نگ هاو واتان چونکه له بریتی یه کتردێت له م وته دا کۆشکێکی . . . . . . . ، هه ندێ جار به م جۆری دووه مه ده لێن هاو واتای ته واو یان ڕاست .

هاواتای ته واو زۆر که مه له زماندا ته نانه ت هه ندێك باوه ڕیان وایه که هه ر نیشه . له ڕاستیدا زۆر گرانه دوو وشه به یه ك واتابمێننه وه و بـژین له زمـانێکدا چونکه ئه مه له توانای زمان که م ده کاته وه ، ئه و وشانه ی که به شێوه یه کی گشتی به هاوواتا داده نرێت ، به ( ٥ ) شێوه له یه کتر جیا ده کرێنه وه :

١ . هه ندی وشه ی هاو واتا هه یه که ده گه ڕێنه وه بۆ دوو دیالێکتی جیاوازی زمانه که وه ك بار ـ ك = قۆڵ قوڕیك = نه وك شاخ = جه ول دارستان =جه نگه ڵ .

٢ . هه ندێکی تر ده گه ڕێنه وه بۆ دوو شێوازی جیاواز : جه ناب / بۆ

٣ . هه ندی وشه هاو واتان له واتای هۆشه کیدا ، به لام واتای کیشه کیان جیاوازه : کچ / کیژ ژن / ئافره ت که ته / زه به لاح

٤ . هه ندێك وشه هاو واتان به لام تاکێکیان ته نیا له چه ند فریزێکدا به و واتایه دێت خۆی شارده وه = خۆی مه لاس دا به لام کتێبه که ی شارده وه * کتێبه که ی مه لاس دا .

٥ . زۆر هاو واتا واتاکانیان نزیکه نه ك وه ك یه ك :

ئازاد = به ره لاـپه ند = گیراو ـ وریا = زیره ك

ده بێت په نجه ش بۆ ئه وه ڕابکێشین که جۆرێکی تریش له هاوواتایی هه یه کا به نده به قه واره وه . دوو وشه یان زیاتر له به ر ئه وه ی له یه ك قه واره دا ده توانن بێت به هاوتا داده نین ـ بۆ نموونه : وشه ی کری و په یدا کرد هـه ردوکیان بـه ڕسته ی یه که م و دێله که و سه گه که بۆ ڕسته ی دووه م ده شێن .

( ١ ) چووه ده ره وه نانێکی . . . . .

( ٢ ) . . . . . . . . . . دوو به چکه ی بووه

به لاّم ئه م جۆره هاو واتاییه چاکتر وایه له گرتنه وه دا چاربکرێت :
په یدا کردن : ـ کرین : دزی : بردن : وسه نن
سه گ ـ دیڵ : تووڵ : تانجی : گه ماڵ

### ۳ ـ دژیایه تی له واتادا:

سێ جۆر دژ ایه تیمان هه یه له واتادا : ( Lyons , 460 )

**( ۱ ) جیاوازی :**

ئه م په یوندییه به به راورد کردنی هه ندی وشه ی وه ك نێر و می دا ده رده که وێت که ره ت کردنه وه ی یه کێکیان ، په سه ندکردنی ئه ویتریانه ، هه روه ها به پێچه وانه شه وه . بۆ نموونه که ده ڵێین ئه و کۆتره نێره ئه وا ئه و راستیه مان ره ت کردۆته وه که می نیه به پێچه وانه شه وه که رسته که نه فی بکه ین ئه و کۆتره نێر نیه ئه وا ئه وه مان په سه ند کردووه که کۆتره که می یه که واته ، پله نیه له نێوان نێر و می دا هه ریه که یان جه مسه رێك ده گرن , ئه وه ی له م جه مسه ره نه بێت ، ده بێت له جه مسه ره که ی تر بێت .
هه مان په یوه ندی له نێوان وشه ی ژن و یا پیاو و کور دابه چاو ده که وێت کاتێك ئه و وشانه ده رباره ی شووکردن وژن هێنان بن . که ده ڵێن : گوڵه ژنه (کردوه ) مه به ستان ئه وه یه کـه کچ نیـه . که ده ڵێین گوڵـه کچه ( نـه کردوه مه به ستمان ئه وه یه که ژن نیه . به م جۆره هه ریه که له م وشانه جه مسه رێك ده گرن و له نێوانیاندا پله ی تر نیه .

( ۲ ) دژ واتایی :

ئه م په یوه ندییه به به راورکردنی وشه ی خراپ و چاك گه وره گه وره و بچوك وده یان وشه ی تردا ده رده که وێت په یوه ندی دژواتایه تی به وه له«جیاوازی»جیا ده بێته وه که«پله داره». مه به ست له پله داری ئه وه یه که دوو وشه که به راورد ده کرێن . به راوردیش دوو جۆره :

( ۱ ) به راوردی دووشت یان دوو که سی جیاواز .
ژیله له شیلان ئازاتره .

خانوکه ی تۆ له وه ی من گه وره تره .

( ۲ ) به راوردی دوو حاڵه تی جیاوازی یه ك شت یان یه ك که س

ژیله له جاران وریا تره .

ئه رکمان له پار قورستره .

هه ردوو جۆره که ده توانین له یه ك بده ین له یه ك رسته دا :

ژیله له جارانی شیلان وریاتره .

تۆ له پاری من ئه رکت که متره .

ده شتوانین ، ئه م و مژیك به جی بهێلین که خوێنه ر الی بکه ین نه زانێت

به راورده که له نێوان دوو که سدایه یان دوو حاله تدا :

ژیله وریاتره

یان له شیلان یان له پاری خوی .......

هه ندی جار به راورده که سه رزاری ده رده بڕیت وه ك له

رسته کانی سه ره وه دا به هۆی تر ...... له وه ده رکه وتووه .

زۆربه ی جار به راورده که هه یه ، به لام ده ر نه براوه . بۆ نموونه که

ده لێین شیلان قوتابیه کی زیره کی پۆله که یه تی مه به ستمان ئه وه یه له

هه ندێکیان زیره کتره وهه ندێکیان له و زیرکترن به لام به راورده که

سه رزاری ده رنه براوه .

ده بێت ئاگه داری ئه وه بین که له هه ندی رۆناندا ئه م وشه

دژ راتایانه پله کاریان بزر نه که ن و که م زۆر هه ست به وه ناکه ین

که به راورد له ئارادا نه یه . بۆ نموونه :

خانوکه ت چه ند گه وریه ؟

چه مه که چه ند قووله ؟

درێژی شه قامه که چه نده ؟

به رزی کاری گوله که نازانم ؟

ئه م رستانه ئه وه ناگه یه نن که خانوکه گه وره یه یان چه مه که قووله یان شه قامه که دریژه یان دار گوله که به رزه له روونانی وادا وشه کان پله کانیان ون ده که ن وبی لایه ن ده وه ستن .

له روویه کی تریشه وه وشه ی دژواتا له وشه ی جیاواز جیا ده بیته وه : له دژ واتاییدا که یه کیك له وشه کانی ره ت ده که ینه وه ، مانای ئه وه نیه که دژه که یمان په سه ند کردوه . بو نموونه که ده لیین (( پیاویکی ئازانیه )) مه رج نیه ئیتر (( پیاویکی ترسنوك )) بیت به واتایه کی تر ، وشه ی دژ واتا خویان چه مسه ره کان ده گرن وبه لام له نیوانیاندا پله ی تر هه یه ، له به ر ئه مه ، که یه کیکیانمان هه ل نه بژارد ، ئیتر ناچار نابین تاکه که ی تر هه لبژیرین ، چونکه ده توانین په نا به رین بو پله کانی نیوانیان .

## ٣ ـ پیچه وانه یی : ـ

ئه م په یوه ندییه دژا واتاییه به به راورد کردنی وشه ی وه کو (( کـرین )) و فروشتن ، (( دان )) و (( وه رگرتن )) ، (( ژن هینان )) و (( شووکردن )) دا ده رده که ویت له جیاتی ٠

١ ـ شیلان قه له مه که ی دا به ژیله .

٢ ـ سامال کتیبه که ی له سامان کری .

٣ ـ عه له گوله ی هینا .

هه مان واتا به پیچه وانه وه ده توانین ده ربرین : ـ

١ ـ ژیله قه له مه که ی له شیلان وه رگرت .

٢ ـ سامان کتیبه که ی به سامال فروشت .

٣ ـ گوله شووی به عه به که کرد .

هه مان په یوه ندی له نیوان ئه م وشانه شدا ده بینین : (( ژن )) و (( میرد )) وه (( باوك )) و (( کچ )) یان (( باوك )) و (( کور )) ، (( خوشکه زا )) و (( پور )) یان (( خال )) . . . . . هتد . بو نموونه که ده لیین (( گولزار خوشکه زای حه مه یه )) وه ك ئه وه وایه (( وتبیتمان )) حه مه خالی گولزاره ئه گه ر له م رسته یه دا گولزار به ناوی یه که م ( ن ١ ) وحه مه به ناوی دووه م ( ن ٢ ) وکاره که به ( ه ) دابنیین ، ده توانین بلیین که په یوه ندی پیچه وانه یی له نیوان هه موو دوو وشه یه کدا هه یه

که بتوانن (( بۆشاییه کان )) پڕ بکه نه وه :

ن ١ . . . . . . . . ی ن ٢ .

ن ٢ . . . . . . . ی ن ١ .

( گوڵه ( ژن ) عه له یه )

( عه له ( مێردی ) گوڵه یه )

که واته ، (( ژن )) پێچه وانه ی (( مێرده )) .

**فۆرم وواتا ( تاریکی وڕوونی وشه ) : ـ**

ئاشکراو به ڵگه نه ویسته که وشه له زمانی مرۆڤدا دوو ڕووی یان دوو دیوی هه یه ، دیوێکی ده نگی یان ڕێنووسی ودیوێکی واتایی . هه ندی زمانه وان به دیوی یه که م ده ڵێن (( ده نگ )) ، هه ندێکی تر به (( فۆرم )) یان (( ده ربڕین )) ناوی ده به ن . دیوی دووه میش پێ ی ده وت (( واتا )) یان (( فۆرم )) په یوه ندی نێوان فۆرم وواتا له نه خشه یه کی وادا ڕوون ده بێته وه :

/ پاژ نیوه ڕۆ / ( پاش نیوه ڕۆ )

فۆرم . . . . . . . . . . . . . . . . . ( ڕێنووس )

( واتا ) ( پاش سه عات دوانزده ی ڕۆژ )

هه ر له سه رتاوه په یوه ندی نێوان ئه م دوو نیوه ی وشه ، فۆرم وواتا ، مشت ومڕێکی زۆر گه رمی له سه ر بووه وهه ر له سه رده می یونانیه کانه وه دوو بۆچوونی جیاواز بۆ ئه م کێشه یه هاتۆته کایه وه . به باوه ڕی سروشتیه کان په یوه ندییه کی ڕاسته وخۆ وبه تین له نێوان فۆرم وواتادا هه یه ، به واتای ئه وه ی که فۆرم له لاسایی (( واتاوه )) هاتووه . به پێچه وانه ی ئه مانیشه وه (( ته قلیدییه کان )) باوه ڕیان وابوو که ئه م په یوه ندییه له خۆوه یه وبه ئاره زووه و به نده به بڕیاری ئه و خه ڵکه ی به زمانه که قسه ده که ن . له سه ره تای ئه م

سه ده یه شدا ، ئه م مشت ومره جاریکی تر هه لی دایه وه ، به تایبه تی له ... ئه وه ی سۆسیر ، داهێنه ری زمانه وانی ته رکیبی ، پشتی ته قلیدییه کانی ... وباوه ره کانی ئه مانی دووبات کرده وه . سه رهه ڵدانه وه ی کێشه که له سه ده کانی ... ئه م سه ده یه دا وئه م مشت ومره گه رمه ی که به دوایدا هات بوو به هۆی ... ده رخستنی هه ندی لایه نی شاراوه ی کێشه که . زۆربه ی زمانه وانه کان ئیستا ... باوه ر یان هێناوه که دوو جۆر وشه له زمانی مرۆڤدا هه یه ، وشه ی روون ووشه ی تاریك . یه کێك له نیشانه کانی تاریکی وشه له وه دا ده رده که وی که هه ... دیارده هه ر زمانێك ناوی جیا جیای لی ده نێ وه ك ئه و وشه یه ی به واتای (( ... )) دی له زمانه ئه وروپاییه کاندا . روونی وشه به سێ رێگه ی جیاواز ده ... ده بینی .

## ١ ـ روونی به هۆی ده نگه وه :

... ی وشه واتاکانیان به هۆی ده نگه کانیانه وه روونه . له به ر ... ده نگه کانیان لاسایی واتاکانیان ، له شێوه ی وشه که وه واتاکانیان پێش ... ده تو ... ئه م وشانه له یه کتر ده چن ته نانه ت له و زمانانه شدا که په یوه ندی ... ... وه کو وشه ی کوکوختی که له چه نده ها زماندا فۆرمه که زۆر ... له یه ...

## ... هۆی رێزمانه وه :

... ئاڵۆز به هۆی رێزمانه وه واتاکانیان روونه چونکه ... زای رێزمانه که بێت ده توانێت وشه کان که رت بکات وتار ... پێش ... واتاکانیان بکات . ئه م جۆره روونیه تا راده یه که چونکه ... له خۆیاندا ... بکن ( نه رمایی = نه رم + ئای / دارخورما = دار + خورما ... خورما ونه رم تاریکن وله وه زیاتر له ت ناکرێن ) .

## ٣ ـ روونی به هۆی خواستنه وه ( خواستنی واتاوه ) .

هه ندی جار واتا ی وشه یه ك به هۆی ئه وه وه روونه که خوازراوه له ... تره وه . بۆ نموونه وشه ی (( به ردانه وه )) له (( دڵت به ردامه وه )) به وشه یه کی روون داده نرێت چونکه خوازه یه به نه د ، به و لێکچوونه ی که له نێوان ... به ربونه وه ی دار و ته خته و به رد وبه ربوونه وه ی دڵ )) دا هه یه .

لێکۆڵینه وه کانی ئه م دواییه بۆمانی روون کردوّته وه که هه موو زمانێك وه کو یه ك نین له په سه ندکردنی وشه ی تاریك ورووندا زمانی ئه ڵمانی بۆ نموونه ، زیاتر ئـه و وشانـه ی زۆره که واتـاکانیـان به هـۆی ریزمانه وه روونـه ، فه ره نسی ، به پێچه وانه وه ، وشه ی تاریکی زۆرتره ، ئینگلیزی له نێوان هه ردووکیاندایه .

**٤ ـ لێکۆڵینه وه له ته می واتایی :**

ئه م بۆ چوونه کاتێك به کاردێت که فۆرمێك چه ند واتایه کی هه بێت . دوو جۆره ته م ومژی واتایی هه یه هه ر چه نده زۆر جار به ئاسانی له یه کتر جیانابنه وه :-

**١ ) فره واتایی :** ـ

**٢ ) هاوبێژی :** هه ندی جار دوو وشه ی واتا جیاواز یه ك فۆرم وه رده گرێت وه کو وشه ی (( مۆز )) و (( ئازار )) . ئه مه ش سێ جۆری هه یه :

**أ ـ هاوده نگه :** ئه و وشانه ن که له وتندا له یه کتر ده چن به ڵام جیاواز ده نوسرێن (له کوردیدا نی یه ) .

**ب ـ هاو پیت :** ئه و وشانه ن که له نووسنیندا وه ك یه کن به ڵام جیاواز ده وترێن هه مانه ، قازی ، خانه ، ره شه . . . . .

**جـ ـ هاوبێژی ته واو :** ئه و وشانه ن که له نووسین ووتندا وه ك یه کن : نموونه : ئاش[١] ( جێ ی هارین ) ، ئاش[٢] ( چێشت ) . ئازار[١] ( ئیش ) ، ئازار[٢] ( ناوی مانگه)

ئه و لێکۆڵینه وانه ی که له م دواییه دا ده رباره ی ته م ومژی واتایی کراون زیاتر گوێیان داوه ته بلاوی (( هاوبێژی )) وئه وگێژاوانه ی که له زماندا په یدای ده کات هاوبێژی له هه ندی زماندا ( ئینگلیزی وفه ره نسی ) زۆر بلاوه ( چونکه وشه ی یه ك برگه یيان زۆره ) . له فره واتاییدا وه ك بۆمان ده رکه وتووه ، په یوه ندییه کی پته و هه یه له نێوان بلاوی وشه و فره واتاییدا . تاوشه یه ك بلاوتر بێت له زمانێکدا ، تازۆر تر به کار بێت ، واتای زیاتر ده بێت .

به م دوو جۆره ته م ومژی واتاییه له گرنگیدا وه ك یه ك نین . فره واتایی کورتی نیه له زماندا به ڵکو تایبه تیه کی گرینگیتی . ئه گه ر فـره واتایی نـه بێت ده بێت بۆ هه موو واتایه ك وشه یه ك هه بێت . هاوبێژی ، به پێچه وانه وه به هیچ

جۆرێك پێویست نیه هه بێت له زماندا . ( ته نیا بۆ پاری کردن به وشـه ده ست ده دات ) . زمـان ده توانێت بێ وشـه ی هاوبێـژ بێت ، وله راستیشـدا زمانی و به تواناتر ده بێت .

له فره واتایی ونه هاوبێژی نابێت به هۆی ته م ومـژ یکی تێکده ر نـه زمانـد چونکه چوار چێوه ی قسه زۆر شت روون ده کاته وه ، هه ر چه نده حـاڵه تی و هه یه که له هه مان چوار چێوه دا له وانه یه زیاتر له واتایه کی وشه یه ك یان چه ند وشه یه کی هاوبێژ بتوانن بێن . گه ر ئه م حاڵه ته زۆر بلاو بێت ، له ئه نجامدا ئه و وشه یه ی که ده بێته هـۆی نه سـازی ده بێت له نـاو بچێت . له فـره واتاییـدا بێگومان ، هه موو وشه که پێویست ناکات فری بدرێ ، به ڵکو یه کێك له واتاکانی وشه که ده روات ، بۆ نموونه ، وشه ی (( دڵگـیر )) به واتـای (( جوان )) دێت هه ندی جاریش به هۆی فرێزی (( دڵ گرتنه وه )) به واتای (( ناخۆش )) دێت جاله به ر ئه وه هه ر کاتێك هه ردوو فۆرمه که توانی له ناو هه مان قه واره دا بێت بو نموونه ، (( چه ند شارێکی . . . . . )) ئه وا فره واتایی وشه که ده بێته هۆی دروست کردنی ته مێکی واسه رلێ تێکده ر که ناچارمان بکات یه کێك له واتاکانی وشه که له ناو به رین بۆ ئه وه ی ته گه ره له رێ ی له یه کتر گه یشتندا نه هێڵین . به چوونی شیکارکردنه وه ی واتا : ـ

هه ندێك زمانه وان بۆ تێ گه یشتن له واتای وشه وای به باش ده زانن که واتاکه رت بکه ن بۆ پارچه واتای بچوکتر ( سیمای جیاکردنه وه ) . ئه م رێگایه که به ( شیکاری پێك هێنه ران )) ناو ده برێت له م سانه ی دوایه دا بلاوبوته وه وبۆیه که جار له لایه ن کاتزوفورده وه به کار هاتووه . به پێ ی ئه م بۆ چوونه په یوه ندی ئه و شانه ( ژن وپیاو وکور وکیژ ) که مرۆڤ ده گرنه وه به م شێوه یه پیشان ده درێت ( Leech , 96 - 97 )

| | مێ | نێر |
|---|---|---|
| هه راش | ژن | پیاو |
| لاو | کیژ | کور |

مـــرۆڤ

وینه که مان دوو ده وری هه یه یه کێکیان (( جـ = س )) پیشان ده دات .
ئه ویتریان ته مه ن ده توانین هه مان واتا به شێوه ی گونجاو ده ربخه ین به هـۆی به کارهێنانی سیمای جیاکردنه وه :
+ مرۆڤ (( ئینسان )) + هه راش (( بالغ )) + نێر (( نێر ))
- مرۆڤ (( حه یوان )) - هه راش (( لاو )) ( نابالغ ) - نێر (( مێ ))
واتای وشه کانی به م جۆره ده رده برێت :
پیاو + مرۆڤ + هه راش + نێر
ژن : + مرۆڤ + هه راش - نێر
کور : + مرۆڤ - هه راش + نێر
کیژ : + مرۆڤ - هه راش - نێر
هاوواتا به پێ ی ئه م بۆ چوونه ده رده که وێت که هه ردوو وشه که هـه مان پێناسه یان ده کرێت . بۆ نموونه وشه ی کچ وکیژ هاووتان ( هه ر چه ن له شێوازدا جیاوازن ) هه ردووکیان هه مان تایبه تیان تێدایه :
کچ = کیژ = ( + مرۆڤ - هه راش - نێر . )
بۆ چاره کردنی فره واتایی وشه که به پێ ی واتا جیاوازه کانی ، تایبه تی جیاواز وه رده گرێت : بۆ نموونه وشه ی (( پیاو )) جگه له و واتـایه ی کـه له سـه ره وه پیشاندراوه ، هه ندی جاری به واتای (( ئینسان )) دێت له رسته ی (( پیاو ئه بێت بۆ سه ندنی حه قی له مردن سڵ نه کات )) . ئه م واته ی دووه مه یه ك تایبه تی به سه بۆ پێناسه کردنی :
پیاو : + مرۆڤ
راستی وچاکی ئه م رێگایه (( شیکاری پێك هێنه ره کان )) له وه دایه که په یوه ندی واتایی ( دژ واتا ، نه سازی ، هاوواتا وگرتنه وه . . . . . هتد ) . پێ ده رده برێت ، ئه م رستانه ی خواره وه ( که په یوه نـدی پیشان ده ده ن ) راستی پێناسه کانی سه ره وه ده سه لمێنن :

ئه وه ده گرێته وه
١ ـ سکرتێره که ژنه . ـــ ؛
٢ ـ سکرتێره که هه راشه ( بالغه ) .

| | |
|---|---|
| ئه وه ش ده گرێته وه | ٣ - دوو کوڕم دی ـــ<br>٤ - دوو لاوم دی |
| ناسازی له گه ڵ | ٥ - سکرتێره که ژنه . ـــ<br>٦ - سکرتێره که پیاوه |
| ناسازیت له گه ڵ | ٧ - باشترین قوتابیم کورێکه . .<br>٨ - باشترین قوتابیم هه راشێکه |

( له هه موو ئه و ڕستانه دا وامان داناوه که ناوه کان بۆ یه ك که س ده گه ڕێنه وه

٩ - ئه و پیاوه هه راشه . ( درێژ دادرێته )

١٠ - ئه و کوره ژنه . ( به درۆ خستنه وه یه )

پێویسته په نجه بۆ ئه و ڕاستیه ڕابکێشین که شیکاری پێك هێنه رانی چوار هه موو کێشه یه که رۆنانی واتایی مان بۆ ناکات وکه م وکورتی زۆری تیایه . به لا کورتیانه نابێت وامان لی بکات که وازی لێ بێنین به ڵکو پێوسته هه وڵ بده ین گه شه ی بده ین چونکه له زۆر سه ره وه ڕێگایه کی چاکه .

## ٤ ) کێلکه واتاییه کان :

زۆر جار واری ده که وێت که کۆمه ڵێك وشه هه موویان به کاردێن بۆ لێدوان ل دیارده یه کی کۆمه لایه تی ، وشه کـان هه مـوویان دیـارده که بـاس ده که ن ، هه ریه که یان بۆ لێدوان له که رتێکی ئه و دیارده یه ده بن وهیچمان له که وتی ئه و یتریاندا کار ناکه ن . وشه کانیش تا ڕاده یه ك له ناو خۆیاندا ناسازن ، به واتای ئه وه ی دوانیان له هه مان کاتـدا ناتـوانن له بـاره ی یه ك شتـه وه بدوێن : کـه چاکه تیکمان به (( شین )) دانا ، بۆ نموونه ، ئیتر هه مان چاکه ت (( سور )) یان (( ڕه نگی )) تر نابێت له یه ك کاتدا . به م جۆره وشه ی : شه ق ، زلله ، مسته کۆڵه ، دارکـاری ، به رده بـاران . . . هتد هـه موومـان بـۆ یـه ك کێڵگـه ی واتـایی ده گه ڕێنه وه که ده توانین ناوی بنێت کێڵگه ی (( لێدان )) له کوردیدا . هه روه ها

کێڵگه ی (( له به رکردن )) له کوردیدا چه ند وشه یه ك به شی ده که ن ده ست کردن ، له پێ کردن وله سه ر کردن و له په نجه کردن . . . . . . هتد .
سه ناوی له م کۆمه ڵانه (( ڕیز کراون )) وه کو ناوی ڕۆژه کانی هه فته و مانگه کانی ساڵ ، پێوانه کان ، ژماره . . . . . . . هتد . زوربه یان بۆ ریز کردن ده بینرێنه‌وه کو ناوی ره نگه کان یان ئه و ناوانه ی پله ی خزمایه تی پیشان ده ده ن . , Spenee )
504 - 507 )

ئـه م کێڵگه واتـابیانـه له زمـانێکه وه بـۆ زمانێکی تـر ده گۆڕیت وزۆربـه ی زمانه وانان باوه ڕیان وایه که ئه م کێڵگانه ره نگ دتنه وه ی فه لسه فه ی ژیان و تێ ڕوانینی خه ڵکه به رامبه ر ده وروبه یان .
کێڵگه ی واتای ده کرێت به دوو به شه وه :
١ ـ کێڵگه ی به رجه سته یی ( کۆنکریت ) .
ئه مه ش له دوو شێوه دا ده بینرێت :

## ا ـ که ره سه ی به رده وام

یه کێك له م جۆره کێڵگانه که ته واو لی ی کۆڵراوه ته وه له زۆر زمانی جیهاندا ، نیزامی ره نگه کانه . له به ر ئه وه ی شه به نگه ی ره نگ چه پکێکی به رده وامه به زۆر ڕێگه و له زۆر شوێندا که رت ده کرێت و جۆرو شوێنی دابه شکردنه که له زمانێکه وه بۆ زمانێکی تر ده گۆڕێت . هه ندێ زمان ( مالی وغینتیای لوی ) هه موو شه به نگه ده کات به دوو که رته وه ( سپی و ره ش ) ، هه ندێك به سێ که رت (زمانی تیفی له نایجیریا ) ،
هه ندیك به (( سپی )) ناوی ده به ن له وانه یه له زمانێکی تردا (( زه رد )) یان (( سه وز )) بێت . هیلمسلیف به م جۆره به راوردی ناوی ره نگه کانی له (( ویلشی )) وئنگلیزیدا کرد .

| | |
|---|---|
| ئه وز | gwyrdd |
| شین | glas |
| خوٚڵه میٚشی | |
| قاوه یی | llwyd |

( Palmer , 1976 , 69 )

### ب ـ که ره سه ی لیٚکپچراو :

دیسانه وه لیٚکوٚلینه وه یه کی زوٚر له سه ر ئه و ناوانه کراوه که خزمایه تی ده گه یه نن له زوٚر زمانی جیهاندا ، به لاّم جیاوازی ته واو له م باره یه وه له مناو زمانه ئه ورپایه کاندا بینراوه . له زمانی هه نگاریدا ، وه ك بوٚمان ده رکه وتووه ، وشه یه کی ساده نیه که به واتای (( خوشك )) یان (( برا ))به کاربیٚت له جیاتی ئه مه وشه ی جیاواز و تاریکی تیٚدایه به واتای (( باجی )) و (( خوشکه بچووك )) و (( برا بچووك )) و کاکه له زمانی تورکیدا وشه هه یه دوو باپیره و ( باوکی باوك ) و (( باوکی دایك )) دوو ته نك (( دایکی دایك )) و (( دایکی باوك )) له یه کتری جیا ده کاته وه . به پیٚچ وانه ی ئنگلیزیشه وه ، زمانه روٚمانیه کان وشه ی جیاواز به کاردیٚنن بوٚ (( مام )) و (( خاڵ )) . هه روها دوو پووریش جیاده که نه وه (( خوشکی باوك )) و (( خوشکی دایك )) .

### ج ـ کیٚلگه ی رووت :

گرنگی کیٚلگه ی واتایی زیاتر له وشه ی رووتدا ده رده که ویٚت . زمانه وانی ئه لمانی ( ثیوٚیر) له باسیٚکیدا ده رباره ی چه ند وشه یه کی هوٚشه کی لـه سالی ۱۹۳۱ دا ته واو بوٚمان روون ده کاته وه که ئه لمانی ناوه راست و ئه لمانی نوی به دوو

ری جیاواز له گه ڵ (( زانین )) دا هه اس و که وت ده که ن . له ... ووبه ری
ه کانی ۱۲۰۰ دا ، به پێ ی دوو بنه ما وشه کان کێڵگه کانیان ... ده ره
گایه تی و بلاوی گرتنه وه ( الشمول ) . ده ره به گایه تی زانین ... دوو
شه وه : زانینی نێو کۆشك ، زانینی ده ره وه ی کۆشك ...
... وه ش ته نیا یه ك وشه ی بۆ هه موو زانین یان به گشتی ( ده ... )
... نا . له گه ڵ که وتنی باسای ده ره به گایه تیدا ، ئه م ... ان
... ه کانی جاریکی تر ... له نوی کێڵگه که یان به جۆرێکی تر ...
م دایه گرامانه دا ده بینین : -




( Palmer , 1976 , 68 )

) بۆ چوونی تێکه ڵی وشه : -

هه ندی زمانه وان ( فیرو پورتریك ، بۆ نموونه ) باوه ریان وایه که به شێك
واتا ی وشه به هۆی هاوریکانیه وه ده رده که وێت . ( ئه و وشانه ی که ده بنه
وسی یان ده ووبه ری ده گرن ) ئاشکرایه کـه به گـوی دانه قـه واره ی وشه
توانین زۆر واتا له یه کتر جیا بکه ینه وه .
نموونه له فۆرمی (پیمه) ناگه ین تا له و هاوریان ورد نه بینه وه که هه ڵیان ده بژێرین:
) پیمه به واتای ( پاره م پێ به ) = هه مه
) پیمه به واتای ( پیم دیشێ ) = قاچمه

هاوری گرتن له وشه دا زۆر جار په یوه ندی به واتای وشه کانه وه نیه . بۆنموونه له گه ڵ ئه وه شدا(شیر)و(سپی)په یوه ندی واتاییان هه یه که م جار ده چنه پاڵ یه ك وفریزی(شیری سپی)نایه ت له دا ، هه رچه نده بۆیه ی سپی په سه نده . هه روه ها هه ڵبزرکاندنی هه ر بۆ شیر ده بێت ( نه ك شله ی تر ) ، ترشاو بۆ چێشت و بۆگه ن کردن بۆ گۆشت و په نیر و جوان بۆ مێینه و قۆز بۆ نێربنه ، هه په بۆ سه ك و حیله بۆ ئه سپ و قاسپه بۆ که و . . . . . . . هتد.

## به شی شه شه م

## نووسین

### ١ - په یوه ندی نیوان قسه و نووسین :

نوسین بریتیه له و هه وله ی که مروڤ داویه تی بۆ تۆمار کردنی قسه تا وه کوو مێژ و ومیراتی تری له فه وتان بپارێزی نووسین زمان نیه به ڵکو له گه ڵ قسه کردنا دووشێوه ی زمانن . نووسین دووجار دوور که وتنه وه یه له راستیه رووداوه کان (واقیع ) چونکه ره مزه بۆ ره مزی تر ( گوتن )

زمان زیاتر گوتنه تا نووسین ، به واته ی زمانه وانه کان به گشتی باوه ریان وایه که قسه یـان گوتن بنچینـه ی زمانـه ئه م پێشـتربه ی گـوتن له م چـوار خالـه ی خواره وه دا ده رده که وێت :

١ - زۆر پێش ئه وه ی نوسین دابێت مروڤ شێوه ی قسه کـردنی زمانی زانیـوه وتا ئیستاش زۆر زمان هه ن که شێوه ی نووسینیان نیه .

٢ - منالێ ساوا یه که م جار فێری شێوه ی قسه کردن ده بێت ، ئینجا پـاش ماوه یه ك شێوه ی نووسین .

٣ - قسـه یان گـوتن ده وریکی بالاتر ده بینێت له ژیـانمانـا ، به واتـه ی ئه وه ی که ئێمه ی مروڤ زۆر تر کاتمان به قسه کردن ده روات وه ك به خویندنه وه ونووسین .

٤ - شێوه ی نووسین تا ماوه یه کی زۆر ده توانین بگـورێن به قسـه یان گـوتن بێ ئه وه ی شتێکی لێ بفه وتێت ، به پێچه وانه وه ی ئه مه وه که قسه تۆماز ده که ین هه ندێك شت ده فه وتێت .

هه ندی تایبه تی نووسین هه یه که له گوتندا ده رناکه وی وه ك به کار هێنانی هێلی خوارو تۆخ یان پره گراف . به لام ئه مانه گرنگ نین له چاو ئـه و تایبـه تیانـه ی قسه که له نوسیندا ده رناکه ون وه ك ئاواز ، هێز ، درێژی ده نگ رژانه ناویه ك . . . هتد جگه له و تایبه تیانه ی ده نگ که تێمان ده گـه یه نیت قسـه که ره کـه مێیه یان نێر ، خوێنه واریان نه خوێنه واره ، به چی دیالێکتی ده دوێ . . . . . . هتد

بۆ نموونە رێنووسی کوردی هە مو ئە م وشـە و فریـزانە ی خـوارە وە وە ك یە کـتر دە نوێنی ، بە لاٚم لە گوتندا بە هۆی هێزە وە جیا دە کرێنە وە لە یە کتر :

هە مانە ۱ = ( ئیمە ئە و شتە مان هە یە ) هە مانە ۲ ( موشە دە مە )

برایە تی ۱ = ( ئە و برای فلاٚنە ) برایە تی ۲ ( دوستایە تی )

رە شە ۱ =( رە نگی رە شە ) رە شە ۲ ( هۆ رە شیدا )

قازی ۱ = ( دادپرس ) قازی ۲ ( تو وە ك قازوای )

جگە لە مە ش رستە هە یە کە دە توانین هە ر جارە واتایە کی بدە ینی بە پیێ ی بە رز کردنە وە ی ونزم کردنە وە ی دە نگمان لە سە ر دوا برگە ی هێزدار ؛ بە واتە یە کی تر ؛ بە پیێ ی گورینی ئاوازی دە نگمان . بۆ نموونە رستە ی (( دێت )) بە چە ند واتایە ك دێت بە پیێ ی ئاوازە کە ی :

۱ ـ دێیت ؟ ( ئایا دێیت لە گە ڵمان ـ بە رز کردنە وە ی دە نك . )

۲ ـ دێیت ( من ئە زانم کە دییت ـ دە نگ بو خوارە وە . )

۳ ـ دێیت ( بتە وی یان نە تە وێت هە ر دێت )

بە لاٚم ، هیچ ، لە م واتا جیاوازانە وە لە نوسیندا دە رناکە وێت .

دیسانە وە رژانە ناو یە ك کە گرنگی هە یە لە زماندا چونکە هە ندی جار واتا دە گۆرێ ، لە نووسیندا نیشانە مان نیە بە رامبە ری ، بۆ نموونە ، رستە ی : ـ

(( ئە م بە ردارە ))

بە دوو واتا دێت بە پیێ ی دیاری کردنی شوێنی رژانە ناو یە کە کە .

ئە م + بە ردارە

ئە مبە ر + دارە

تە نانە ت کورتی ودرێژی دە نگیش زۆر جار بە نووسین پیشان نادرێت .

بۆ نموونە ، لە کوردیدا ئە و بزوینە درێژانە ی دە کە ونە دواوە وهێزیان دە چێتە سە ر تە نانە ت درێژ تریش دە بن . بە لاٚم ئە م راستیە لە نووسیندا نـانوێنـرێت بە راوردی بزوینی / آ / ی درێژ بکە لە سە رە تا وکۆتایی وشە ی : ـ

(( ئازا )) و (( ئاوا )) و (( ئاغا )) و (( ئالاٚ )) و (( ئاخوا )) دا بۆ سە لماندنی ئە م راستیە .

لە گە ڵ ئە مانە شدا دە بێت لە یادی نە کە ین کە نوسین لە هە ندی سە یە وە لە گوتن چاکترە ، نووسین زۆرتر دە مێنێتە وە وکە متر دە گۆرێت لە بە ر ئـە وە بۆ

پاراستنی مێژ وو ومیراتی ترمان چاکتر ده ست ده دات له گوتن . جگه له مه ش ، له گه ڵ هاتنه ده ره وه یدا له ده م نافه ‌وتی وده گرێته وه دواوه . له به ر ئه وه له نێو ئه و کۆمه لانه دا که تائێستا نووسین نیه مێشکی مروڤ ئه رکێکی گه وره ی ده که وێته ئه ستۆ ئه ویش کۆکردنه وه ی راستیه‌کانی ژیانه . نووسین ، که واته ، هۆیه که بو ئاسانکردنی ئه رکی مێشك وله وانه شه هه ر ئه م هۆیه بوو بێت که له بنچینه دا وای له مروڤ کرد بێت هه وڵ بدات رێگایه ك بدۆزێته وه بۆ پاراستنی قسه .

## ٢ ـ داهێنان وپه یدا بوونی نووسین : ـ

په یدابوونی نووسین به دوو قوناغی سه ره کیدا ده روات : ـ

### ١ ـ قۆناغی واتایی :

له م قۆناغه دا واتا به هوی وێنه وه ده گه یه نرا بێ ئه وه ی گوێ بده نه زمان ، به واته یه کی تر ، وێنه که راسته وخۆ واتای وه رده گرێت بێ ئه وه ی بگورێت به ده نگه ( زمان ) . ئه م قۆناغه ش به دوو هه نگاوی گه وره بررا :

### أ ـ نووسینی وێنه یی : ـ

ئه مه کۆنترین شێوه ی نووسینه ومه رج نیه له بنه ره تدا هه روه ك هه ندی له زمانه وانه کان باوه ریان وایه ، بۆ گه یاندنی واتا بوو بێت ، به ڵکوو بۆ ده ربرینی توانای هونه ری وهه ستی ئاینی بووه . له م جۆره نووسینه دا رووداویکی ئاڵۆز به هۆی وێنه که یه وه ده نوینرێت بێ گوی دانه زمان . ئه م وێنه یه ی خواره وه که لاسای وه سیقه یه کی گرنگی میسریه کانه ، به ته واوی تێمان ده گه یه نیت نووسینی واتای چۆنه .

بنکه که ی ژێره وه وێنه ی زه ویه وبه قامیشه کاندا دیاره که بۆ ئه و زه وییه ده گه رێته وه که قامیشی لی ده روێت ـ ده لتای نیل ـ . ئه و سه ره که به زه وییه که وه لکاوه خه لکی شوێنه که ن ، هه ڵوکه وێنه ی شاکه یانه وبه وه شا که سه ره که ی ده کێشی دیاره که ئه و زه ویه ی داگیر کردوه وهه موو خه لکه که ی

گرتوه . پێویسته دووپاتی بکه ینه وه که ئه م جۆره نووسینه په یوه ندی به زمانه وه نیه ـ بیره کان به رامبه ر وشه ناوه ستن .



ب ـ نووسینی بیری :

له م قۆناغه دا ، وێنه که له جیاتی ئه وه ی به ههه ئالۆزمان بۆ لیك بداته وه وه ك ئه و چیرۆکه ی سه ره وه ، ته نیا تاقه بیریك ده رده بڕێت ، یان بۆ یه ك شت ده گه ڕێته وه . ته ماشای ئه م نموونه نووسینه بیریانه ی خواره وه بکه بزانه که هه ریه که یان ته نیا یه ك واته یان هه یه یان به رامبه ر یه ك بیر ده وه ستن .

   

خانوو خۆر چاو چیا

لێره شدا دیسانه وه ده بێت بزانین که وێنه کان په یوه ندیان به زمانه وه نیه .

جـ نوسینی وشه یی یان مۆرفیمی :

له م جۆره نوسینه دا نیشانه بۆ هه موو مۆرفیمه کان یان وشه کانی زمان داده نرێت تاکه که لکی نووسینی وشه ی له وه دایه که جیاوازی نێوان دایالیکته کان گرنگی نادرێتی ، به واته ی ئه وه ی که قسه که ر به هه ر دایلێکتی بدوێت ده توانێت له نووسینه که بگات کاتێك شاره زایی له په یوه ندی وێنه و وشه کاندا

په یداکرد . که م وکورتی نووسینـه که ش لـه وه دایه کـه گرانـه بوفێـربوون یـان فێرکردن چونکه ژماره ی مۆرفیم یان وشه له زماندا زۆره وسنورێکی داخراویشیان نیه ، له به ر ئه مه ژماره ی ئه و وێنانه ی که پێویسته بێ سنـوورن وهه ر لـه زۆر بونیشدا ده بن .

نووسینی وشه پیش دیسانه وه په یوه ندی راسته و خۆی به زمانه وه نیه . له به ر ئه وه ده توانین ، بۆ نموونه ، نیزامی نووسین وده نگی زمانی چینی له یه کتر جیا بکه ینه وه وهه ر فێری یه کیکیان ببین .

## ٢ ـ نوسینی ده نگی یان فۆنه تیکی :

له م قۆناغه دا نیشانه کان راسته و خۆ واتا ده رنابرن به ڵکو ده گۆرێنه وه بـۆ ده نگ وده نگه کـان واتایـان ده دریێ . ئه مـه ش له دوو شێـوه ی سه ره کیـدا ده بینرێت . :

## أ ـ نووسنی برگه یی :

لێره دا ره مزیان نیشانه بۆ هه مو برگه کانی زمانه که داده نـرێت . دیسانـه وه له به ر زۆری برگه کانی زمان و زۆری وێنه کان ئه م جۆره نووسینه ته نیا به که ڵکی زمانێك دێت که برگه ی له یه کچووی زۆر بێ و دوو پان بێته وکو زمانی یابانی . نووسینی عه ره بی تاراده یه ك له م جۆره یه .

## ب ـ نووسینی فۆنیمی یان ئه لف ـ بایی :

ئه م جۆره ئیستـا بلاوتـرین جۆری نـووسینه لـه گیتی دا . لێره دا هـه موو فـۆنیمه کـانی زمان نیشـانه ی بـۆ داده نرێت . یـه کێك لـه چاکـه کانی ئـه وه یه که ژماره ی نیشانه کانی زۆر که متره له جۆره کانی تر له به ر ئه وه بۆ فێر بوون و فێر کردن زۆر ئاسانتره .

نووسینی فۆنیمییش له هه موو زمانێکدا وه ك یه ك نیه . له هه ندی زماندا ( تورکی و

فینلندی ) ژماره ی نیشانه کانی وه ك ژماره ی فۆنیمه کانه . به واتایه کی تر نووسین و قسه کردن ته واو گونجاون له هه ندی زمانی تردا له به ر ئه وه ی نووسینه که ماوه یه کی زۆر به سه ریا رۆشتوه و ناو به ناو نه گۆراوه تا له گه ل گۆرانی زماندا ده رچێت ، نووسین وقسه کردن تارادە یه ك نه گونجاون له زمانی ئنکلیزی یان فه ره نسیدا ، بو نموونه فۆنێم زۆره که به هۆی چه ند نیشانـه یه کی جیـاوازه وه ده نوسێت . هه روه ها نیشانه ش هه یه که به رامبه ر زیاتر له فۆنمیك ده وه ستێ . زمانی کوردی له نێوانایه . به واتایه کی تر ، تـاراد یه کی زۆر لـه سه ر بنـه مای فۆنێمی یه .

## ٣ ـ دانه کانی ئاستی نووسین :

نوسین وه ك ئاسته کـانی تری زمـان خاوه نی چـه ند دانـه یه کی خـۆیه تی . بچوکترین دا نه ی نووسین که به ئه رکیك هه لْسی گرافیمه ( پیت ، دیـسانه وه به پی شـوێن پیت له وانـه یه شێـوه بگورێت . بـه شێوه جیـاوازه کانی پیت ده وتـرێت ئه لۆگراف ( هاو پیت ) . بو نموونه پیتی [ ك ] له کوردیدا ، چاند ئه لۆ گرافیکی هـه یه بـه پیٚ ی شوین . لـه مانـه [ ك ] که لـه دوای وشـه وه دێت و [ ك کـه له سه ره تاوه دێت . هه روه ها بیتی [ ج ] دوو ئه لۆگرافی هه یه [ جـ ] سه ره تاو [ ج ] . پیتی درشت وپـیتی ورد که له هه ندی زماندا هه یه دیسانه وه به ئه لۆگرافی یه کتری داده نرێن .

هه ندی جار نیشانه یه ك یان پیتیکی لێکدراو ( دایه گراف ) به کار دێت بـۆ نواندنی تاکه ده نگێك . بۆ نموونه ، زۆر جار بۆ نواندنی / ف / لەئینگلیزیدا تیپی ) ( Ph به کار دێنی ( بروانه Phone) ، هه ندی زمانه وان ، پیتی [ ر ] و [ ل ] وته نانه ت [ ش ] به دایگراف ده ژمێرن چونکه دوو نیشانه مان به کار هێناوه بۆ نواندنی تاکه فۆنمیك .

هه ر وه ك چۆن فۆنیم که رت ده کرێت بۆ پارچه ی وردتر له خۆی ( سیفه‌ای جیا کردنه وه ) ده شتوانین پیت که رت که ین بۆ له تی بچوکتر وه ك : هێلی شکاو ، راست ، ئه ستونی ، ئه لقه . . . هتد .

دانه یه کی تر هه یه که هه ندی جار له نووسینی مۆرفیمیدا ناوی ده برێت ئه ویش

مۆرفوگرافه ، به واتای ئه و نیشانه یه ی که به ته نیا خۆی به رامبه ر مۆرفیمیـك ده وه ستی . بۆ نموونه رێنووسی عه ره بی زۆر جار په نا ده باته به ر ئه م دانه یه ( بروانه پیتی [ ي ] له وشه ی یدرس دا که له وانه یه مۆرفیمی [ ي ] یان [ ي ] بنوێنی به پی شوێنی له رسته : ـ
یَدرسُ ، ( رانه بردوو ) ، یان یُدرَسَ ( را نه بردووی نادیار )

## سه رچاوه كان

### ا . به عه ره بی : -


١ . البحث اللغوى عند العرب ، أحمد مختار عمر ، دار المعارف بمصر ، ١٩٧١

٢ . دراسة الصوت اللغوى ، د . أحمد مختار عمر ، القاهرة ، ١٩٧٦

٣ . البحث اللغوى عند الهنود وأثر على اللغويين العرب ، أحمد مختار عمر ، دار الثقافة - بيروت ١٩٧٣

٤ . مشكلة البينه لزكريا ابراهيم ، مكتبة مصر ، ١٩٧٦

٥ . نظرياتفي اللغة ، أنيس فريحة ، دار الكتاب اللبنانى ، بيروت ١٩٧٣

. لغة الهمس ، د . مصطفى شحاته ، ١٩٧٢

اللغة والمفكر ، د . نورى جعفر ، مكتبه النوحى رباط ، ١٩٧١


### ب - به كوردی :


١ . سه ره تاییه یه ك له فیلۆلۆژی زمانی كوردی ، محمه د ئه مین هه ورامانی ١٩٧٢

٢ . زمانی كوردی له به ر رۆشنایی فۆنه تیك دا ، د . ئه وره حمانی حاجی مارف

٣ . وشه رۆنان له زمانی كوردی دا ، د ئه وره حمانی حاجی مارف ، ١٩٧٧

٤ . لایه نیكی جیاوازی د . وریا عمر أمین ، گۆڤاری كۆری زانیاری ، به رگی ١٠ ، ١٩٨٣

٥ . فۆنۆلۆجی د . وریا عمر أمین ، كاروان ، ژماره ٢٠ / ١٩٨٤

٦ . فۆنه تیك ، غازی فاتح وه یس ، ١٩٨٤

٧ . ئا وه ڵناو له رسته ی كوردیدا ، د . كوردستان موكریانی . كاروان ژماره ٥ ، ١٩٨٣

٨ . زمانی كوردی بۆ ده سته ی كه ران ، د . كامل حسن البصیر چاپخانه ی زانكۆی سلێمانی ، ١٩٧٧

٩ . قاموسی زمانی كوردی ، عبدالرحمن محمد أمین زه بیحی ، به رگی ٢ چابخانه ی كۆری زانیاری كورد ، ١٩٧٩

References

Barber , C . L . The story of Language , London , Panbooks 1965
Bell and Hooper , Syllables and segments , Northholland . 1976
Bolinger , D. Regarding Language , Newyork , Harcourt Brace Jovanovich , 1972
Haugen , E. Analysis of linguistic borrowings in Approaches to English Historical linguistics
Roger Lass ( ed ) Bloomington , Indiana , 1969 .
Hayakawa , Language in thought and action , Newyork , Harcourt Brace 1976 .
Hudson , R, A. , Linguistic form : system and structure in Encyclopaedia of linguistics ,information and control , Metham and Hudson ( ed ) Pergamon press , 1974 .
Hyman , I . M. Phonology , theory and analysis , Holf and Winston , 1975.
Langacker , R . W . Language and its structure , 1968 .
Laver , J ., Language and non - verbal communication in Language and speech (Carterette and Friedman , Newyork , 1969 .
Lyons , John , Introduction to theoretical linguistics , Cambridge University Press , 1969 .
Mackenzie , D . N ., Kurdish Dialect Studies , London , Oxford University Press , 1961 .
McCarus , E., A . Kurdish Grammar , American Council of Leaned Societies , 1958 .
Malmberg. Bertil , Phonetics . Newyork : 1963 .
Palmer , F., Grammar , Harmondsworth , 1971 .
———————, Semantics , Cambridge University Press , 1982 .

Pei , Mario , Glossary of Linguistic Terms , Newyork : Anchor books , 1966 .

Pyles , T., and Algeo , J. English : an introduction to Language , Newyork : Harcourt Brace , 1970 .

Saussure , Ferdinand , de , Course in general linguistics . (trans . ) Newyork . 1959

Spence , C . W . Semantics : sign and symbol in Encyclopaedia of Linguistics .

————————, Semantics : Field Theories . in Encyclopasedia of Linguistics .

Strang , Barbara , Modern English Structure , London , 1962 .

Swaminatham , R., The word in IRAL Vol XI / I February , 1973 .

Wardhanugh , Ronald . Introduction to Linguistics , Newyork : McGraw Hill , 1972 .

West , Fred , The way of language , Newyork : Harcourt Brace , 1976 .

